أحمد ديدات

# بژاردەی نێوان ئیسلام و مەسیحیەت



وەرگێرانی
نهاد جلال حبيب الله



چاپی یەکەم
2016

# بژاردەی نێوان ئیسلام

# و

# مەسیحیەت

نوسینی

احمد دیدات

وەرگێڕانی

نهاد جلال حبیب الله

چاپی یەکەم 2016

بسم الله الرحمن الرحيم

## ناسنامەی کتێب


- ناوی کتێب: بژاردەی نێوان ئیسلام و مەسیحیەت
- نوسینی: احمد دیدات
- وەرگێڕانی: نهاد جلال حبیب الله
- نۆرەی چاپ: یەکەم 2016
- تیراژ: 1000 دانە
- بڵاوکار: ناوەندی رۆشنبیر
- شوێنی چاپ: تاران . چاپخانەی پەنجەرە

لەبەڕێوەبەرایەتی کتێبخانەگشتیەکان ژمارەی سپاردنی

(      ) ی ساڵی 2016 ی پێدراوە.




# پێشەکی وەرگێڕ:

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە، خوایە سوپاس بۆ تۆ بەو جۆرەی شیاوی گەورەیی‌و شکۆتە، صەلات و سەلامی خوا لە پێغەمبەری خواو ئالوبەیتی نازداری.

دەمێك بوو تامەزرۆی ئەوە بووم هەوڵێکی سەردەمیانەی موسڵمانان بەدی بکەم سەبارەت بە مشتومڕێکی زانستیانە لەگەڵ ئاین و ڕێبازە جیاوازەکاندا، جا هەریەکەو تایبەتمەندی وەربگرێت لە بوارێکدا، مشتومڕێك کە تیایدا موسڵمان سەری بەرز رابگرێت و ئەم دەستپێشخەر بێت، نەك یەخەی بگرن و لە ناچاریدا بکەوێتە بەرگریکردن، وەك خوای گەورە موسڵمانان بەمجۆرە پەروەدە دەکات:

﴿ فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦١﴾ ﴾ آل عمران: ٦١

(ئینجا هەر کەسێك دەمە قاڵێی لەگەڵ کردیت(لە بارەی عیساوە) دوای ئەو زانینەی کە(بە سرووش) بۆت هات تۆش پێیان بڵێ وەرن با بانگی

کوڕەکانمان و کوڕەکانتان وە ژنەکانمان و ژنەکانتان وە خۆمان و خۆتان بکەین لە پاشان لەخوا بپاڕێینەوە ئینجا نەفرەتی خوا بکەین لە درۆزنان.)

جا یەکێك لە بوارەکانی گفتگۆی موسڵمان بریتیە لە گفتگۆ لەگەڵ مەسیحیەتدا، ئەوانەی بانگەشەی شوێنکەوتەیی عیسا دەکەن و بۆ موسڵمانان لە هەموان نزیکترن، بۆیە زمانی نەرمی و لێکتێگەیشتن لەگەڵیاندا پێویستترە.

جا لەو نێوەندەشدا ئایەتێکی قورئانی پیرۆز زۆر سەرنجڕاکێشە کە مەسیحیەکان دەدوێنێ تا لە سەرچاوەی تێگەیشتن و رازیبوونی خۆیانەوە بڕیار بدەن، ئەویش گەڕانەوە بۆ ئینجیل:

﴿ وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِۚ ﴾ المائدة: ٤٧

(دەبا پەیڕەوانی ئینجیل حوکم بکەن بەوەی کە خوا ناردوویەتیە خوارەوە تیایدا).

یەکێك لە کارە ناوازەکانی گفتگۆیەکی هێمنانەو دڵسۆزانەو زانستیانەی موسڵمانانو مەسیحیەکان، بەرهەمی دەستی کەڵەپیاوێکی سەردەمی نوێ بوو کە ئەویش شێخ ئەحمەد دیداتە بەر ڕەحمەتی خوا بکەوێت، بەندەش وەك وەفایەك بۆ رەنجی ئەو پیاوەو ئەرکێکی ئایینی و مرۆیی خۆم و

دڵسۆزیەك بۆ خوێنەرانی ئازیز، کتێبێکی ئەو کەڵەپیاوەم هەڵبژارد تا وەریبگێڕمە سەر زمانی کوردی، ئەویش بریتیە لە کتێبی (بژاردەی نێوان ئیسلامو مەسیحیەت) کە تیایدا بە زمانێکی نەرمو زانستی مەسیحیەکان دەدوێنێو هەر لە کتێبی پیرۆزی خۆیانەوە بەڵگەکانیان بۆ دێنێتەوە، ئینجا بەراوردیان دەکات بە دەقە ئیسلامیەکان.

ئەگەرچی کتێبی پیرۆز بە زمانی کوردیش بەردەستە، بەڵام رەخنەیەکی شێخ ئەحمەد دیدات ئەوەیە کە وەرگێڕانەکانی ئینجیل بە زمانەکان دەستکاری کراون و چەمکەکان گۆڕان، بۆیە ئەوەی زیاتر باو و بڵاو و وردتر بێت لە نوسخەی کتێبی پیرۆز بە زمانی ئینگلیزی و عەرەبی بەردەستمان دەکەوێت، ئێمەش پشتمان بەستووە بە وەرگێڕانی دەقە عەرەبیەکانی کتێبی پیرۆز کە لە نوسخەی عەرەبی ئەم کتێبەدا دانراون.

دواجار هیوام وایە ئەم هەوڵە نەوازشیە دەروازەیەکی نوێ بێت بۆ هەوڵی زیاتر و بەهێزتر و تاکی موسڵمان ئەمە بە سنووری کۆتاییهاتن بە هەوڵەکان نەزانێت و درێژە بدەن بە رێرەوە بانگخوازیەکەی شێخ ئەحمەد، ئەگەریش لەم بەرهەمو هەوڵەی وەرگێڕانە رازین ئەوە بە تاکە نزایەکیش بێت باوكو دایکم بێبەش نەکەن لە نزای خێر.

نهاد جلال حبيب الله

2 رەبیعولئەووەلی 1437کۆچی

## کورتەیەك سەبارەت بە ئەحمەد دیدات

ئەحمەد حەسەن دیدات لە ساڵی 1918 لە هەرێمی سورات لە هیند لە دایك بووە، لە ساڵی 1926 دا ئینجا چاوی کەوتووە بە باوکی، باوکی سەرقاڵی پیشەی بەرگدرووبی بوو و دوای ماوەیەکی کەم لە لەدایکبوونی ئەحمەد چوو بۆ باشووری ئەفریقیا.

لە ساڵی 1927 دا ئەحمەدیش ماڵئاوایی لە دایکی کرد و چوو بۆ لای باوکی، ئیتر ئەوە ماڵئاوایی یەکجارەکی بوو لە دایکی، چونکە چەند مانگێکی نەخایاند دایکی وەفاتی کرد.

ئەحمەد لەوێ نەچوویە خوێندنگەوە، چونکە هەژاریەکی سەخت ژیانی داگرتبوون، تەمەنی نۆ ساڵان بوو کە بە فەرمی چوویە خوێندنگە، ئەویش لە شارێ کە زمانی ئینگلیزی تیایدا زاڵ بوو.

ئەحمەد زۆر خۆی سەرقاڵ دەکرد بە خوێندنەوەوەو توانی پۆلی شەشەم تەواو بکات، بەڵام کێشەی پاڵپشتی دارایی رێگر بوو لە درێژەدان بە خوێندنەکەی، بۆیە کەوتە ناو ئیشی بازاڕ، لەو کارانەشی بریتی بوو لە شاگردی دووکانی کابرایەکی موسڵمان کە توانی لەوێوە تێکەڵ بە مەسیحیەکان ببێت و دەست بکات بە بانگەوازەکەی و سەرکەوتنێکی باشی بەدەستهێنا، ئەمە وایکرد ئەحمەد دیدات زیاتر گەرم بێت لەسەر بانگەواز بۆ

ئیسلام‌و له‌و بواره‌دا نموونه‌یه‌كی ناوازه‌و ده‌گمه‌نی پێشكه‌ش كرد كه كاریگه‌ریه‌كه‌ی به‌ روونی له‌ هه‌ر كونجێكی ئه‌م جیهانه‌دا دیاره.

ئه‌حمه‌د دیدات دواتر دامه‌زراوه‌ی سه‌لامی دامه‌زراند تا بانگخوازانێكی موسڵمان پێ بگه‌یه‌نێت، خێزانه‌كه‌شی له‌ كاره‌كانیدا هاوكاری بوو.

هه‌روه‌ها ئه‌حمه‌د دیدات یه‌كێك بوو له‌ دامه‌زرێنه‌رانی ناوه‌ندی بانگه‌وازی ئیسلامی و دواتریش خۆی بوو به‌ سه‌رۆكی ناوه‌نده‌كه‌، نزیكه‌ی بیست كتێبی بڵاو كرده‌وه‌و ملیۆنه‌ها نوسخه‌ به‌ خۆڕایی دابه‌شكران‌و به‌و هۆیه‌وه‌ هه‌زاران كه‌س موسڵمان بوون.

له‌ ساڵی 1986 دا خه‌ڵاتی مه‌لیك فه‌یصه‌ل درا به‌ ئه‌حمه‌د دیدات.

به‌شی یه‌كه‌م

# بەشی یەکەم

# وتەی کتێبی پیرۆز

# سەبارەت بە

# موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)

## باسی یەکەم:

## یەکەم دیمانەم:

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ ﴾ الأحقاف: ١٠.

(ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) بڵێ پێم بڵێن ئەگەر (ئەم قورئانە) لەلایەن خواوە بێ ئێوەش باوەڕتان پێ نەهێنابێ وە کەسێك لە نەوەی ئیسرائیل شایەتی دابێ لەسەر وێنەی (ئەوەی وا لە) قورئاندا جا ئیمانی هێنابێ کەچی ئێوە خۆتان بە گەورەزانی بێگومان خوا ڕێنموونیی گەلی ستەمکاران ناکات.)

ئامادەبوانی ئازیز بابەتی ئەم ئێوارەمان بریتیە لە (وتەی کتێبی پیرۆز سەبارەت بە موحەممەد(ﷺ))،[1] بێگومان ئەم باسە دەبێتە شتێکی نوێ بۆ زۆربەتان، چونکە ئەمجارە ئەوەی قسەتان بۆ دەکات موسڵمانێکە، جا چۆنە موسڵمانێك پێشبینیەکانی کتێبە پیرۆزەکانی جوولەکەو مەسیحیەت باس بکات.

---

[1] - ئەمە دەقی کۆڕێکی نووسەرە کە لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی بیستەمدا پێشکەشی کردووە.

من لە سالانی 30 – 40 تەمەنمدا کە گەنجێ بووم، ئامادەی زنجیرە کۆڕێکی ئایینی بووم کە قەشەیەکی مەسیحی لە شانۆی پاشایی دربن پێشکەشی دەکرد، ئەویش قەشە هایتین بوو.

پاپا یان کیسەنجەر؟

ئەو قەشە بەڕێزە باسی پێشبینیەکانی کتێبی پیرۆزی دەکردو هەوڵی دەدا بیسەلمێنێت کتێبی پیرۆزی مەسیحیەت هەواڵی دەرکەوتنی یەکێتی سۆڤێتی لە دوارۆژدا باسکردوە، خێرا گەیشتە ئەوەی بیسەلمێنێت پاپا لە پێشبینیەکانی کتێبی پیرۆز دەرنەچووەو هەوڵیدا جەماوەرەکەی قەناعەت پێ بکات کە (البهیمە 666) لە کتێبی پیرۆزدا بریتیە لە دکتۆر هینری کیسنجەرە، زانایانی مەسیحی داهێنەرن و لە سەلماندنی پرسی خۆیاندا ماندوێتی نازانن.

ئەو وانانەی قەشەکە وایان لێکردم بپرسم ئەگەر کتێبی پیرۆز هەواڵ و پێشبینی هەبووبێت بۆ چەندین شت –تەنانەت پاپا و ئیسرائیلیشی لەبیر نەکردووە– بە دڵنیاییەوە دەبێت قسەیەکیشی هەبێت سەبارەت بە چاکسازی گەورەی مرۆڤایەتی پێغەمبەر موحەممەد(ﷺ).

لێرەوە دەستم کرد بە گەڕان بەدوای وەڵامدا، قەشە دوای قەشە چاوپێکەوتنم دەکرد و ئامادەی کۆڕەکان دەبووم، هەرچیەك پەیوەندی هەبوایە بە هەواڵ و پێشبینیەکانی کتێبی پیرۆزەوە و بەردەست بوایە دەمخوێندەوە، ئێستاش یەکێك لە چاوپێکەوتنەکام لەگەڵ قەشەیەکی کڵێسای چاکسازی هۆڵەندیدا دەگێڕمەوە بۆتان.

**سیانزەهەم بەختەکەم بوو:**

بانگهێشت کرام بۆ ترانزڤال تا بەبۆنەی یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر موحەممەدەوە(ﷺ) وتەیەك پێشکەش بکەم، ئەو هەرێمەش لە کۆماری باشووری ئەفریقیا بوو کە تیایدا زمانی ئەفریقی باو بوو، کاتێك تەنانەت لەگەڵ ئەندامانی گەلەکەی خۆمدا قسەم دەکرد، ئیتر هەستم بەوە کرد پێویستە هیچ نەبێ شتێ لەو زمانە شارەزا بم تا زیاتر هەست بە تێکەڵی نیشتمان و گەلەکەم بکەم، دەفتەری ژمارەگە تەلەفۆنەکانم کردەوەو دەستم کرد بە پەیوەندی کردن بە چەند کڵێسایەکی ئەفریقی و حەزو تامەزرۆیی خۆم نیشاندا بۆ بینینی قەشەکان، بەڵام هەموویان داواکەیان بەرپەرچ دامەوەو هەرکامیان بیانووی ڕەوای پێ بوو بۆ ئامادەنەبوونەکەی، بەڵام کەسی سیانزەهەم بەختەکەی من بوو، ئەمیان خۆشیەکی زۆری پێ بەخشیم

کاتێك قەشە هاردن رازی بوو دوای نیوەڕۆی ڕۆژی شەممە لە ماڵی خۆیدا دیدارم لەگەڵ ببەستێت، هەمان ڕۆژ وادەم بوو کە بچم بۆ ترانزڤاڵ.

قەشە هاردن پێشوازیەکی گەرمی لێکردم و داوای لێکردم ڕێ بدەم کابرایەکی ناسراوی کە تەمەنی حەفتا ساڵان دەبوو ئامادە بێتو بەشداری مشتومڕەکە بکات، منیش ڕێگر نەبووم و هەرسێکمان لە کتێبخانەی قەشەکەدا دانیشتین.

## بۆچی هیچ شتێك؟

پرسیارێکم خستەڕوو: کتێبی پیرۆز سەبارەت بە موحەممەد (ﷺ) چی دەڵێت؟ ئەویش بێ هیچ دوودڵیەك وەڵامی دامەوە هیچ شتێ، منیش پرسیم بۆچی نا؟ بۆچی نا؟ خۆ بەپێی شرۆڤەکانی ئێوە لە کتێبی پیرۆزدا زۆر شت هاتووە سەبارەت بە دەرکەوتنی یەکێتی سۆڤیەت سەردەمی نوێ و تەنانەت سەبارەت بە پاشای کاسۆلیکی ڕۆمان؟! ئەویش وتی بەڵێ، بەڵام سەبارەت بە موحەممەد هیچ نەهاتووە، منیش جارێکی دی پرسیم بۆچی نا؟ بەدڵنیاییەوە ئەو پیاوە(موحەممەد (ﷺ)) کە هۆکاری پێکهێنانی کۆمەڵگەیەکی نێودەوڵەتی چەند ملیۆنیەو هەموان گوێڕایەڵی وتەی ئەون و بڕوایان هەیە بە:

1- موعجیزەی لەدایکبوونی عیسا.

2- عیسا بریتیە لە مەسیح.

3- عیسا بە فەرمانی خوا مردووی زیندوو کردووەتەوە.

4- عیسا بە فەرمانی خوا نابینا و گەڕوگولی چاك کردوەتەوە.

دەی دەبێت بە دڵنیاییەوە کتێبی پیرۆز سەبارەت بەو سەرکردە گەورەیە قسەیەکی هەبێت، ئەو سەرکردەی قسەی چاكو جوانی هەیە سەبارەت بە عیسا و مەریەمی دایکی؟!

کابرای پیری میوان وەڵامی دامەوە: کوڕی شیرینم من ماوەی پەنجا ساڵە کتێبی پیرۆزم خوێندووەتەوە، ئەگەر وردە باسێکیشی لەبارەوە بهاتایە من دەمزانی و دەمبینی.

کەسێك نیە بەو ناوەوە:

منیش پرسیارم کرد: بەو پێیەی جەنابت دەڵێیت مەگەر لە عەهدی قەدیمدا سەدان پێشبینی نین سەبارەت بە هاتنی عیسا؟ ئەویش بە تاسەوە وەڵامی دایەوە نەك سەدان بەڵکو هەزاران، منیش وتم مشتومڕی من سەبارەت بە یەك و هەزار نیە، چونکە هەموو جیهانی ئیسلامی بێ بوونی هیچ پێشبینیەکی ناو کتێبی پیرۆز بڕوای هەیە بە هاتنی عیسا، ئێمەی موسڵمان دان دەنێین بە عیسادا، ئەمەش تەنها بەپێی شایەتی موحەممەد (ﷺ)، ئێستا لە جیهاندا ملیارێ زیاتر موسڵمان هەن لە جیهاندا کە شوێنکەوتەی موحەممەدن و عیسای پێغەمبەریان خۆش دەوێت و رێزی دەگرن و بەرزی رادەگرن، بێ ئەوەی پێویست بکات مەسیحیەکان بە بەڵگەی کتێبی پیرۆز قەناعەت بەو موسڵمانانە بکەن، دەی تۆ دەتوانیت لەنێو ئەو هەزاران پێشبینیەی باسی دەکەیت تەنها یەك پێشبینیم پێ بڵێیت کە ناوی عیسای هێنابێت؟ ئەوەی چەمکی مەسیح وەرگێڕدراوە بۆ یەسووعی مەسیح ناو نیە بەڵکو نازناوە، ئایا پێشبینیەك هاتووە بڵێت مەسیح ناوی عیسا و دایکیشی مەریەم دەبێت، وەك بڕواپێکراوە باوکی یووسفی دارتاشەو لە نێو دەسەڵاتی پاشا هیرۆددا لەدایك دەبێت..، ئەو وردەکاریانە نین، دەی ئیتر چۆن ئەوەت یەکلاکردەوە کە ئەو هەزاران بەڵگەیە دەگەڕێنەوە بۆ عیسا؟

پێشبینی چیە؟

قەشەکە وەڵامی دایەوە: تۆ دەزانیت پێشبینی چەند وشەیەکن کە وێنەی رووداوێکی داهاتوو نیشان دەدەن، جا کاتێك شتێك بە راستی دێتەدی و روودەدات بەدیهاتنی روونی ئەو پێشبینیەو ئەوەی لە رابردوودا باسی کردووە بەدیدەکەین..، منیش وتم ئەو حەقیقەتەی جەنابت ئەوەیە کە هەڵێنجان و گونجاندنی نێوان دوو شتە؟ وتی بەڵێ، وتم دەی ئەگەر وابێت بۆ بەڵگەهێنانەوە بۆ بانگەشەکەت هەزار پێشبینی بێنیت -لەگەڵ رێزم بۆ هەڵکەوتەیی عیسا-، بۆچی هەمان ئەو رێکارە بۆ موحەممەد (ﷺ) بەکارناهێنیت؟ قەشەکەش قسەکەی بەدڵ بوو و بە پێشنیارێکی دادوەرانەو رێگەیەکی ژیرانەی دانا بۆ هەڵسوکەوت لەگەڵ کێشەکە.

داوام لێکرد سیفری (تثنية الإشتراع - إصحاح 18 الفقره 18) (کە کتێبی پێنجەمە لە کتێبی پیرۆزی جوولەکەو مەسیحیەکان) بکاتەوە، ئەویش کردیەوە، هێندەی توانیم بە ئەفریقی دێرەکەم خوێندەوە، چونکە ئامانجم بوو وا بیخوێنمەوە تا راهێنانێکی سادە بێت بۆ زمانی زاڵی ناو باشووری ئەفریقیا (لە نێو براکانیاندا پێغەمبەرێکیان بۆ دەنێرم وەك تۆ و وتەم دەخەمە ناو دەمیەوەو چیم پێ سپاردووە هەموویان پێ دەڵێت) (کتێبی پیرۆز -سیفری ئیشتراع 18:18).

پێغەمبەرێ وەک مووسا!

دوای ئەوەی بە زمانی ئەفریقی ئەو دێڕەم خوێندەوە، پۆزشم هێنایەوە کە نەمتوانی جوان دەیبڕم، قەشەکەش دووپاتی کردەوە کە زۆر جوان بە ئەفریقی خوێندوومەتەوە، منیش وتم ئەو پێغەمبەرایەتیە بۆ کێیە؟ ئەویش بێ هیچ دوودڵیەک وتی عیسا، وتم بۆچی عیسا؟ خۆ لەوێ ناوی نەهێنراوە؟ قەشەکە وتی چونکە پێشبینی چەند وشەیەکن هەندێ رووداوی داهاتوو روون دەکاتەوە، جا دەبینین وشەکانی دێڕەکە تەواو وەسفی ئەو پێغەمبەرە دەکات، گرنگترین وەسفی ناو دێڕەکەش چەمکی(وەک تۆ) یە، واتە وەک مووساو عیسا، منیش وتم عیسا لە چ روویەکەوە لە مووسا دەچێت؟ لە وەلامدا وتی: یەکەمجار مووسا جوولەکە بووەو عیساش هەروا،ئینجا مووسا پێغەمبەر بووەو عیساش هەروا، بۆیە عیسا لە مووسا دەچێت، ئەمەش هەمان شتە کە بە تەواوی خوای گەورە هەواڵی داوە بە مووسا(وەک تۆ)، منیش وتم پێت وایە لێکچوونی تر هەبێت لەنێوان عیسا و مووسادا؟ قەشەکە وتی نەخێر، منیش وتم جا ئەگەر تەنها ئەو دوو پێوەرە بن بۆ پێشبینیەکەی کتێبی پیرۆز، هەر هەمان پێوەرەکان دەکرێت پەیڕەو بکرێن بەسەر کەسایەتیە باسکراوەکانی ناو کتێبی پیرۆزدا(سولەیمان، ئەشعیا، حزقیال، دانیال، هووسیا، جویل، ملاخی، یوحەننا موعەمدان.. .

چونکە هەموو ئەوانەش هەم جوولەکە بوون و هەم پێغەمبەریش بوون، جا بۆچی ئەو پێغەمبەرایەتیە پەیڕەو ناکرێت بەسەر هیچکام لەو پێغەمبەرانەدا؟ بۆچی تەنها عیسا؟ بۆچی ماسی بخەینە دەستێك و باڵندە بخەینە دەستەکەی ترەوە؟ قەشەکە وەڵامی پێ نەبوو، منیش قسەی خۆمم تەواو کرد (کەوابێت گەیشتوومەتە ئەو ئەنجامەی عیسا زۆر لە مووسا ناچێت، ئەگەریش هەڵەم راستیەکەم فێر بکە).

سێ جیاوازی:

ئەم قسەی دەیکەم سێ هۆکاری هەیە:

یەکەم: پلەوپایەی عیسا جیایە لە مووسا، چونکە بەپێی قسەی ئێوە عیسا خوایە، بەڵام مووسا وانیە، مەگەر وانیە. ئەویش وتی بەڵێ، وتم دەی کەوابوو عیسا لە مووسا ناچێت.

دووەم: بەپێی قسەی ئێوە عیسا وەك خۆ بەختکردن بۆ هەڵەکانی جیهان مردووە، بەڵام مووسا لەبەر هەڵەی جیهان خۆی بەخت نەکردووەو بمرێت، وانیە؟ هەمدی وتی بەڵێ، وتم دەی بۆیە عیسا لە مووسا ناچێت.

سێیەم: بەپێی قسەی ئێوە عیسا سێ رۆژ لەناو ئاگردا مایەوە، بەڵام مووسا ئەوەی نەکرد، ئەمەش وایە؟ پچڕ پچڕ وەڵامی دایەوە (ب ـ ە ـ ڵ ـ ێ) منیش وتم دەی کەوابوو عیسا لە مووسا ناچێت.

بەڵام ئەی قەشە ئەمانە راستی سەلماوو بەرچاو نین، تەنها چەن مەسەلەیەکی بیروباوەڕن کە دەکرێت خەڵکی گشتی بیزانن و لەسەریان سەخت بێت، رێم بدە شتێکی زۆر سادەو ئاساییت بۆ شرۆڤە بکەم کە ئەگەر خەڵکی گشتیش بێن گوێی لێ بگرن ئاسان لێی تێدەگەن، مۆڵەتم دەدەیت؟ بەڵام قەشەکە زۆر ئەو پێشنیارەی پێ خۆش نەبوو.

## باسی دووەم: هەشت بەڵگەی بێ چەنوچوون

باوك و دایك:

یەکەم: مووسا باوك و دایکی هەیەو موحەممەدیش (ﷺ) باوك و دایکی هەیە، بەڵام عیسا تەنها دایکی هەیە و لە مرۆڤ باوکگی نیە، وانیە؟ قەشەکەش وتی بەڵێ، وتم دەی کەوابوو عیسا لە مووسا ناچێت، بەڵکو موحەممەد (ﷺ) لە مووسا دەچێت.

لەدایکبوونی ئاسایی:

دووەم: مووساو موحەممەد بە لەدایکبونێکی ئاسایی لەدایك بوون، ئەویش لە بەیەکگەیشتنی پیاو و ژنێك، بەڵام عیسا بە موعجیزەیەکی تایبەت بەدیهێنرا، بیرت بێت ئێمە لە ئینجیلی قەشە مەتتا (18:1) بۆمان باسکراوە (...پێش ئەوەی کۆببنەوە(یووسفی دارتاش و مەریەم) بە رۆحی پیرۆز – مەریەم– سکپڕ بوو).

قەشە لۆقایش پێمان دەڵێت کاتێك خوا هەواڵی دا بە مەریەم کە کوڕی پیرۆزی دەبێت/ مەریەم پرسیاری کرد (... چۆن شتی وا دەبێت کە من هیچ پیاوێك ناناسم؟ فریشتەکەش وەڵامی دایەوە رۆحی پیرۆز بۆت جێبەجێ دەکات، هێزی باڵا سێبەرت بۆ دەکات) (لوقا 35:1).

قورئانی پیرۆزیش جەخت دەکاتەوە لە لەدایکبوونی بە موعجیزەی عیسا و بە دەربڕینێکی جوان و بالاّ باسی کردووە، کاتێك مەریەم دەپرسێت:

﴿قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ ۖ قَالَ كَذَٰلِكِ اللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ ۚ إِذَا قَضَىٰ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ (٤٧)﴾ آل عمران: ٤٧

(مەریەم وتی خوایە چۆن منداڵم دەبێت لەکاتێکدا هیچ مرۆڤێکم خۆی پێ نەگەیاندوم، -فریشتەکەش- وتی خوای گەورە بەو چەشنە چی بوێت بەدیدەهێنێت، ئەگەر بڕیاری فەرمانێکی دا هەر پێی فەرموو ببە دەبێت).

ئیتر خوا پێویستی بەوە نیە وەچەیەك لە مرۆڤ یان گیانەوەرێکدا بچێنێت، بەڵکو هەرکە ویستی لەسەر بوو ئیتر دەبێت، ئەمە دیدی موسڵمانە سەبارەت بە عیسا پێغەمبەر، (کاتێك لەگەڵ ریف دۆنکەرز سەرۆکی کۆمەڵەی کتێبی پیرۆز لە گەورەترین شاری خۆمان قسەم کرد و بەراوردی دەقی قورئانی و دەقی کتێبی پیرۆزم کرد لەسەر مەریەم، وتم تۆ کام لەو دوو دەقەت پێ باشترە تا بەرامبەر کچەکەی خۆت بوترێت؟ دەقە قورئانیەکە یان دەقەکەی کتێبی پیرۆز؟ ئەویش سەرێکی جووڵاند و وتی قورئانیەکە).

بە کورتی بە قەشەکەم وت مەگەر لەدایکبوونی عیسا موعجیزە نەبووە لەکاتێکدا لەدایکبوونی مووسا و موحەممەد ئاسایی بووە؟ بە شانازیەوە وەڵامی دایەوە بەڵێ، وتم دەی لەبەرئەمەش عیسا لە مووسا ناچێت، بەڵکو

موحەممەد لە مووسا دەچێت، لە سیفری (تثنية الإشتراع 18:18) هاتووە خوا بە مووسای فەرموو(وەك تۆ) واتە وەك مووسا، موحەممەدیش وەك مووسایە.

پەیوەندی هاوسەرگیری:

سێیەم: مووساو موحەممەد (ﷺ) هاوسەرگیرییان کردووەو منداڵیشیان ناوەتەوە، بەڵام عیسا هەموو ژیانی بە زوگرتی مایەوە، مەگەر وانیە؟ قەشەکە وتی بەڵێ، وتم دەی لەبەرئەمەش عیسا لە مووسا ناچێت، بەڵکو موحەممەد لە مووسا دەچێت.

حەلکی دانیان تەنا بە عیسادا:

چوارەم: هەریەك لە مووساو موحەممەد لەلایەن هۆزەکانیانەوە لە ماوەی ژیانی خۆیاندا وەك پێغەمبەر قبووڵ کران، بێگومان جوولەکە برێك سەختی و نارەحەتی زۆر و دڕندانەیان تووشی مووسا کرد، بەڵام وەك ئوممەت هەموان دەیانزانی مووسا پێغەمبەری خوایە، هەروەها عەرەبیش هەڵوێستی زۆر توندیان نواند بەرامبەر بە موحەممەد (ﷺ) و بە دەستیانەوە تاڵی زۆری چەشت، دوای سیانزە ساڵ بانگەوازی ناو مەککە شاری خۆی جێهێشت، بەڵام پێش وەفاتی عەرەب وەك پێغەمبەری خوا دانیان پێدانا،

بەڵام بەپێی کتێبی پیرۆز هاتووە (–عیسا– بۆ دەستەی تایبەتی هات و دەستە تایبەتەکەشی قبووڵیان نەکرد) (یوحەننا: 11:1) ئەمڕۆش دوای دوو هەزار ساڵ هێشتا گەلی جوولەکە دانی پێدا نانێن، مەگەر وانیە؟ قەشەکەش وتی بەڵێ، منیش وتم دەی لەبەرئەمەش عیسا لە مووسا ناچێت، بەڵکو موحەممەد لە مووسا دەچێت.

(دەسەڵاتداری)

پێنجەم: مووساو موحەممەد هەردووکیان پێغەمبەر و دەسەڵاتداریش بوون، پێغەمبەر وەك کەسێك کە خوا سروشی بۆ ناردووە تا ڕێنموونی مرۆڤ بکات، ئەویش بێ کەموزیاد بیگەیەنێت بە دروستکراوانی خوا، دەسەڵاتداریش واتە ئەو کەسەی توانای حوکمڕانی کوشتن یان ئازادکردنی خەڵکی هەبێت، ئیتر گرنگ نیە ئەو دەسەڵاتدارە تاجی لەسەر بێت یان جلوبەرگی پاشای لەبەربێت، ئەگەر مافی دەرکردنی بڕیاری سزادانی هەبێت ئەوە پاشایە، مووساش ئەو مافەی هەبوو، جا ئەو ئیسرائیلیەت لەیادە کە ڕۆژی شەممە چیلکەی کۆدەکردەوەو مووسا بەردبارانی کرد تا مرد (36:15) چەند تاوانی تر هەبون کە لە کتێبی پیرۆزدا باسکراون و بە فەرمانی مووسا سزای مەرگ دراوە بەسەر تاوانباراندا، موحەممەدیش (ﷺ) هەمان دەسەڵاتی هەبوو.

لە کتێبی پیرۆزدا باسی چەند پێغەمبەرێك هاتووە کە تەنها فەزڵی پێغەمبەرایەتیان پێدراوە، بەڵام دەسەڵاتدار نەبون تا فەرمانەکانیان

بسەپێنن، هەندێ لەوانە کە خوا وا ڕێزداری کردون توانای بەرنگاربوونەوەی ئەو دژایەتی و نەیاریە سەختەیان نەبووە کە بەرامبەر پەیامەکەیان ئەنجام دراوە، لەوانەش (پێغەمبەر لووقا، پێغەمبەر یوحەننا، پێغەمبەر دانیال، پێغەمبەر عەزرا، پێغەمبەر یوحەننا موعەمدان) تەنها توانیویانە پەیامەکە بگەیەنن، ئیتر یاساکەیان بە هێز بەسەریاندا پەیڕەو نەکردووە، پێغەمبەر عیساش سەر بەو دەستەی پێغەمبەرانەیە، ئینجیلی مەسیحیش جەخت لەمە دەکاتەوە، کاتێك لەلایەن حاکمی ڕۆمانیەوە عیسا تۆمەتبار کرا بە تۆمەتی هاندان، خاڵی بنەرەتی بەرگریکردن لە خۆی بەرامبەر بەو تۆمەتە ناڕەوایە ئەوەبوو (شانشینی من لەم جیهانەدا نیە) (شانشینی من لەم جیهانە نیە، ئەگەر شانشینی من لەم جیهانە بوایە خزمەتکارەکانم تێدەکۆشان تا تەسلیم بە جوولەکە نەکرێم، بەڵام ئێستا شانشینی من لێرە نیە) (یوحەننا: 36:18).

ئەمە قەناعەتی کردووە بە بیلاتی بتپەرست کە بڕوای وابوو عیسا هەموو توانای عەقڵی نەبووە، ئەگەرنا هەر لە سەرەتای مەترسی بۆ سەر شانشینەکەی جەنگی بەرامبەر دەکرا، بۆیە عیسا تەنها داوای شانشینێکی ڕۆحانی کردووە لە جیهانێکی تردا و تەنها داوای ئەوە بووە پێغەمبەرێ بێت، جا ئایا ئەمە دروستە؟ قەشەکە وەڵامی دایەوە بەڵێ، منیش وتم دەی لەبەرئەمەش عیسا لە مووسا ناچێت، بەڵکو موحەممەد لە مووسا دەچێت.

نەبوونی یاسای نوێ:

شەشەم: مووسا و موحەممەد (ﷺ) هەردووکیان یاسا و ڕێکخستنی نوێیان پێ بوو بۆ قەومەکانیان، مووسا تەنها دە وەسیەتی نەبووو و بەس، بەڵکو یاسایەکی ڕەسمی گشتگیری هێنا بۆ ئاراستەکردنی ئوممەتەکەی، موحەممەدیش نێردرا بۆ خەڵکێکی دەشتەکی و زۆر نەزانو زبر، ئەوان باوەژنی خۆیان مارە دەکردەوە، کچی خۆیان زیندەبەچاڵ دەکرد، مەینۆشی و داوێنپیسیان هەبوو و بتیان دەپەرست، غیبۆن وا وەسفی باری عەرەب دەکات پێش ئیسلام (بەراورد بە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی نەزانی و دواکەوتەیی دایگرتبوون و لە دڕندەییەکی مرۆییدا بوون و تا ئاستێك بڵێین هێندە بێ هەست و هەژار بوون سەخت لە ئاژەڵ جیا دەکرانەوە).

ئیتر سەخت بوو مرۆڤ و ئاژەڵ جیا بکرێتەوە، ئاژەڵ بوون لە شێوەی مرۆڤدا، کەچی موحەممەد (ﷺ) ئەوانی لەو پەستی و نزمیە دەکرد.

تۆماس کارلایس دەڵێت ئەو چرای ڕووناکی و زانستەی پێی بوو بۆ عەرەب وەك لەدایکبوون بوو لە تاریکیەوە بۆ ڕووناکی، ئیتر نیمچە دوورگەی عەرەبی بۆ یەکەمجار بە تەواوی واتا زیندوو دەرکەوت، لەکاتێکدا هەر لە سەرەتای درووستبوونەوە وێڵی ناو بیابان بوون، موحەممەد (ﷺ) لە ماوەی سەدەیەکدا جیهانێکی گەورەی دروست کرد، ئەوەبوو عەرەب لە ڕۆژئاواوە گەیشتە غەرناتەو لەوبەریشەوە گەیشتە نیودەلهی، بە بەرگی دلێری و

رووناکی هەڵکەوتەییەوە عەرەب رووناکی خۆی بەسەر بەشێکی گەورەی جیهاندا نیشاندا... لە راستیدا موحەممەد (ﷺ) یاسا و سیستمێکی نوێی وای بەخشی بە گەلەکەی کە پێشتر وێنەی نەبوو.

جوولەکە پێیان وایە عیسا فریودەر بووەو ویستوویەتی رێنماییەکانی ئەوان بشێوێنێ، عیساش نارەحەتی زۆری چەشت تا بۆیان بسەلمێنێت ئەو ئایین‌و سیستم و یاسایەکی نوێی نەهێناوە، بەڵگەی ئەمەش وتەی خۆیەتی (وا گومان مەبەن من هاتوم بۆ هەڵوەشاندنەوەی نامووس–پەیامی جبریل– یان پێغەمبەران، من بۆ هەڵوەشاندنەوە نەهاتوم، بەڵکو بۆ تەواوکاری هاتوم، من حەقم و پێتان دەڵێم تا کاتێ ئاسمان و زەوی ئاوا دەبێت پیتێ یان تاکە خاڵێ ئاوا نابێت تا هەمووی ئاوا نەبێت). (مەتا5: 17–18).

بە دەربڕینێکی تر عیسا یاسا و سیستمی نوێی نەهێناوە، بەڵکو تەنها هات تا یاساکانی پێشوو رێکبخاتەوە –دەبوو جوولەکان لەمە تێبگەیەنێت– ئەو لەمەشەدا مەبەستی ئەوە نەبوو بیەوێت بە زمان جوولەکە لەخشتە بەرێت تا وەك پێغەمبەرێ دانی پێدا بنێن و لەناخەوە ئایینێکی نوێی شاردبێتەوە، نەخێر بەڵکو ئەو پێغەمبەری خوایەو هەرگیز پەنا نابات بۆ فرت‌و فێڵ، بەڵکو خودی عیسا پێغەمبەر رێنماییەکانی جێبەجێ دەکرد و رێنماییەکانی مووسای سەردەخست و رێزی رۆژی شەممەی لابوو، تاقە جوولەکەیەکیش نەبوو دەرفەتی ئەوەی هەبێت پێی بڵێت بۆچی رۆژوو

ناگریت یان پێش نانخواردن دەستەکانت ناشۆیت، ئەمە لەو تۆمەتانە بوو دەدرانە پاڵ شوێنکەوتووەکانی عیسا، بەڵام بەرەو رووی خۆی نەکرانەوە، چونکە عیسا خۆی جوولەکەیەکی پیاوچاك بوو کە رێزی یاساکانی پێغەمبەرانی پێش خۆی دەگرت، بە کورتی عیسا ئایینێکی نوێی دانەهێنا و وەك مووسا و موحەممەد یاسای نوێی پێ نەبوو، ئایا ئەمە راستە؟ قەشەکەش وتی بەڵێ، وتم دەی لەبەرئەمەش عیسا لە مووسا ناچێت، بەڵکو موحەممەد لە مووسا دەچێت.

### جۆری کۆچکردن:

حەوتەم: مووساو موحەممەد (ﷺ) هەردووکیان بە مەرگێکی ئاسایی مردن، بەڵام بەپێی مەسیحیەت کتوپڕ عیسا لەخاچ درا، مەگەر وانیە؟ قەشەکە وتی بەڵێ، منیش وتم دەی لەبەرئەمەش عیسا لە مووسا ناچێت، بەڵکو موحەممەد لە مووسا دەچێت.

### نشینگەی ئاسمانی:

هەشتەم: مووساو موحەممەد (ﷺ) هەردووکیان لە زەویدا خراونەتە ناو خاك، بەڵام بەپێی وتەی ئێوە عیسا لە ئاسماندا ماوەتەوە، مەگەر وانیە؟ قەشەکە وتی بەڵێ، منیش وتم دەی لەبەرئەمەش عیسا لە مووسا ناچێت، بەڵکو موحەممەد لە مووسا دەچێت.

# باسی سێیەم بەڵگەی زیاتر

ئیسماعیل یەکەم منداڵە:

بەوجۆرەی قەشەکە لەو وتانەی پێشوودا بێ ئەملاولا بەڵێی بۆ دەکردم، منیش وتم جەنابی قەشە، تا ئێستا تەنها یەك خاڵی پێشبینیەکەت بۆ سەلماوە، ئەویش ئەوەیە دەستەواژەی (وەك تۆ) واتە وەك مووسا، جا پێشبینیەکە زۆر زیاترە لەو یەك دەستەواژەیە، دەقەکە دەڵێت(لەنێو براکانیاندا پێغەمبەرێکیان بۆ دەنێرم وەك تۆ)، جا با تیشك بخەینە سەر دەستەواژەی (لەنێو براکانیاندا).

لێرەدا مووساو گەلەکەی کە جوولەکەن وەك یەك یەکەی ریشەیی دەدوێنرێن، بێگومان عەرەبیش برایانی جوولەکەن، تۆ دەزانیت کتێبی پیرۆز باسی ئیبراهیم خەلیلولاهی کردووە، ئیبراهیم دوو ژنی هەبووە، سارەو هاجەر، هاجەر سکی پڕ بوو لە یەکەم منداڵی ئیبراهیم کە ئیبراهیم یەکەم منداڵی لە هاجەر ناونا ئیسماعیل (سیفری تەکوین 15:16)، ئیبراهیم کوڕەکەی برد (سیفری تەکوین 23:17)، کوڕەکەی تەمەنی سیانزەساڵ بوو کە خەتەنە کرا (سیفری تەکوین 25:17)، تا ئیسماعیل بوو بە سیانزە ساڵی تاکە کوڕو وەچەی ئیبراهیم بوو، دواتر کە پەیوەند ئیبراهیم بە پەروەردگاریەوە زیاتر بوو، خوا کوڕێکی تری بەخشی بە ئیبراهیم لە سارەوە کە ناوی نا ئیسحاق، ئیسحاق برابچووکی ئیسماعیلی برای بوو.

عەرەب و جوولەکە:

کە ئیسماعیل و ئیسحاق کوڕی یەك باوك بن کە ئیبراهیمە، ئەوە برای یەکن، منداڵەکانیشیان دەبنە برای یەکدی، بۆیە براکانی ئیسحاق کە جوولەکەن و منداڵەکانی ئیسماعیلیش کە عەرەبن بران، ئینجیلیش ئەمە دووپات دەکاتەوە، ئیسماعیل لەپاڵ براکانیدا ئامادەیە (سیفری تەکوین 12:16)، ئیسماعیل بە ئامادەبوونی براکانی دەمرێت (سیفری تەکوین 18:25)، بۆیە منداڵەکانی ئیسحاق برایانی ئیسماعیلیەکانن، بە هەمان ڕێڕەو موحەممەدیش (ﷺ) برای ئیسرائیلیەکانە، چونکە لە وەچەی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمە.

ئەمەش دەقاودەقی پێشبینیەکەیە(لەنێو براکانیدا) (سیفری ئیشتراع 18:18)، پێشبینیەکە بە روونی باس لەوە دەکات پێغەمبەرێ دێت کە وەك مووسا دەبێت و دەشبێت لە نەوەکانی ئیسحاق یان لە خۆیان نەبێت، بەڵکو لەنێو براکانیاندا بێت، بۆیە موحەممەد (ﷺ) لە نێو براکانیاندا بوو.

چاپك دەرمەینی:

پێشبینیەکە دەڵێت(...وتەم دەخەمە ناو دەمیەوە) جەنابی قەشە داوا لە جەنابت دەکەم سیفری ئیشتراع 18:18) بکەیتەوە، تکایە بیخوێنەرەوە، وانووسراوە (وتەکانم خستە ناو دەمت) قەشەکە وتی نا، منیش وتم ئەی ئەگەر من زمانێکی تازەم پێ وتیت کە هیچی لێ نازانیت وەك زمانی عەرەبی و داوام لێکردیت ئەمەی دەیخوێنمەوە بیخوێنیتەوە یان دووبارەی بکەیتەوە وەك:

﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴿٤﴾ ﴾ الإخلاص: ١ – ٤.

(بڵێ: ئەوە خوای تاك و تەنیا، ئەو خوایەی بێ نیاز و جێ ی نیاز و ئومێدە، کەسی لێ نەبووەو لەکەس نەبووە، وە هەرگیز هیچ کەس هاوشێوە و هاوتای نی یە)

ئایا ئەو وشانەی کە پێشتر نەتبیستون و بە زمانێکی بیانیی نەمخستووەتە سەر زمانی تۆ؟ قەشەکەش هاوڕام بوو، ئینجا پرسیم وشەکانی قورئانی پیرۆز سروشی خوان بۆ موحەممەد پێغەمبەری ناردووە.

مێژوو باس دەکات موحەممەد (ﷺ) تەمەنی چل ساڵان بوو و لە ئەشکەوتێ بوو کە سێ میل لە باکووری مەککەوە بوو و لە شەوی بیست و حەوتی مانگی رەمەزاندا لەناو ئەشکەوتەکەدا جبریلی سەرکردەی فریشتەکان فەرمانی پێکرد بە زمانی دایکی خۆی ئەمە بخوێنێتەوە:

﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ (١) خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢) اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ (٣) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (٤) عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ (٥) ﴾ العلق: ١ – ٥.

(ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) بخوێنە بە ناوی پەروەردگارتەوە کە هەموو شتێکی دروست کردووە، مرۆڤی دروست کردوە لە خوێنێکی بەستوو، بخوێنە، پەروەردگاری تۆ(لە هەموو کەس)بەخشندەترە، ئەوەی کە(مرۆڤی) فێر(ی نووسین) کردووە بەقەڵەم، مرۆڤی شارەزا کردووە بەو شتانەی کە نەیدەزانی)

ئەمە یەکەم سروشی خوا بوو دابەزی بۆ سەر موحەممەد (ﷺ) و ئێستا دەکەوێتە سەرەتای سوورەتی نەوەدو شەشی ناو قورئانی پیرۆز.

## شاهیدی حه‌ق:

راسته‌وخۆ فریشته‌که‌ چوو و موحه‌ممه‌دیش (ﷺ) چوویه‌وه‌ بۆ ماڵه‌وه‌و دڵته‌نگ و په‌شێو بووو داوای کرد له‌ هاوسه‌ره‌که‌ی تا داپیۆشێت، خێزانی چاودێری ده‌کرد، کاتێك ئارامی بۆ گه‌ڕایه‌وه‌ چی دیبوو و بیستبوو بۆی گێڕایه‌وه‌، خێزانه‌که‌شی بڕوای خۆی به‌ مێرده‌که‌ی دووپات کرده‌وه‌و دڵنیای کرده‌وه‌ که‌ خوا هه‌رگیز ڕێ نادات شتی مه‌ترسیدار بێته‌ڕێ، ده‌ی ده‌کرێت ئه‌مه‌ دانپێدانانی که‌سێکی بوختانچی بێت؟ ده‌ی که‌سی بوختانچی دان به‌وه‌دا ده‌نێت که‌ فریشته‌یه‌کی خوا رایسپاردووه‌ به‌ په‌یامێکی باڵا و به‌ ترس و شێواویه‌وه‌ بگه‌ڕێته‌وه‌ و بچێته‌وه‌ ماڵه‌وه‌؟ چ ره‌خنه‌گرێ ده‌توانێت بزانێت په‌رچه‌کردار و دانپێدانانه‌کانی هی که‌سێکی دڵسۆز و ده‌ستپاکن، ده‌ی پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) ده‌ستپاك (الامین) بوو.

له‌ ماوه‌ی بیست و سێ ساڵدا –که‌ ماوه‌ی پێغه‌مبه‌رایه‌تیه‌که‌ی بوو– له‌ زمانیه‌وه‌ وته‌كانی ده‌وتران و کاریگه‌ریه‌کی گه‌وره‌ی کرده‌ سه‌ر عه‌قڵ‌و دڵه‌کان، کاریگه‌ریه‌ك که‌ سڕینه‌وه‌ی نیه‌، قه‌باره‌ی قورئانی پیرۆز زیادی کرد، جاران له‌سه‌ر گه‌ڵای خورما و پێسته‌و ئێسقان ده‌نووسرایه‌وه‌، پێش وه‌فاتی ئه‌و وشانه‌ جوان ریز کران به‌و چه‌شنه‌ی ئه‌مڕۆ له‌ قورئانی پیرۆزدا ده‌یبینین.

وشەکان(سروشی خوایی) بە تەواوی لە زمانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) وەرگیران وەك چۆن لە پێشبینیەکەی کتێبی پیرۆزدا هاتووە(وتەم دەخەمە ناو دەمیەوە) (سیفری ئیشتراع 18:18).

## پێغەمبەری نەخوێندەوار:

تاقیکردنەوەکەی موحەممەد (ﷺ) لە ئەشکەوتی حەرائدا کە دواتر ناسرا بە شاخی نوور و وەڵامدانەوەکەی سەرەتای سروش بوو، ئەمەش بە تەواوی واتا هاتنەدی پێشبینیەکی تری کتێبی پیرۆز بوو، چونکە لە سیفری ئەشعیا ئیصحاحی 29 ڕیزی 12 دا هاتووە(یان کتێب دەدرێتە کەسێك کە نووسین نازانێت).

لە قورئانی پیرۆزیشدا هاتووە(پێغەمبەری نەخوێندەوار)، پێی دەوترێت (تکایە ئەوە بخوێنەرەوە)، (وشەی تکایە لە دەستنووسە عیبریەکاندا نەهاتووە، ئەمەش بە بەراورد بە ڕۆمانی کاسۆلیك نوسخەی دویووای و ئەو نوسخانەی پێداچوونەوەیان بۆ کراوەو پوخت کراونەتەوە، وتی(نووسین نازانم) ئەمە وتەی موحەممەد(ﷺ) بوو کە دوو جار بە ڕوحولقودوس جبریلی وت کاتێك جبریل فەرمانی پێکرد (بخوێنە).

رێ بدە دێڕەکە بە تەواوی و بێ پارچە پارچەکردن بخوێنمەوە، لە نوسخەی مەلیك جیمس یان نوسخە جێمتمانەکانی کتێبی پیرۆزدا هاتووە(یان کتێبەکە دەدرێت بە کەسێك کە نووسین نازانێت، وە پێی دەوترێت تکات لێ دەکەم ئەوە بخوێنەرەوە، ئەویش دەڵێت من نووسین نازانم). (سیفری ئەشعیا 12:29).

دەکرێت بڵێین لە سەدەی شەشی مەسیحیدا کە موحەممەد (ﷺ) تیایدا ژیاوە کتێبی پیرۆز بە زمانی عەرەبی نەبووە، چ جای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) نەخوێندەوار بووەو هیچ خوێندەواری نەبووە، هیچ کەس تاکە وشەیەکیشی فێر نەکردووە، تەنها فێرکاری خوای گەورە بووە.

خوای گەورە دەفەرموێت(وما ینطق...القوی). (النجم 3-5).

ئاگاداریەکی گرنگ:

جەنابی قەشە بڕوانە چۆن پێشبینیەکە لەگەڵ موحەممەددا(ﷺ) گونجاوەو ئەڵێیت بەرگێکەو بە باڵای خۆیدا چنراوە، ئیتر نامانەوێت بەزۆر پێشبینیەکە بکێشین و دەستکاری بکەین تا بگونجێت بۆ موحەممەد (ﷺ).

قەشەکەش وەڵامی دایەوە: هەموو باسو وتەکانت عاقڵانە دێنە بەرچاو، بەڵام ئەنجامێکی حەقیقییان نیە، چونکە ئێمەی مەسیحی عیسای

مەسیح بە خوا دەزانین و پێمان وایە خۆی لە شێوەی مرۆڤێکدا نیشان داوە کە لە کۆیلایەتی هەڵەو تاوانەکان رزگاری کردوین.

منیش لێم پرسی گرنگ نیە، خوا بڕوای بەوە نیە، خوا هەڕەشەی خۆی کردووە، خوا خۆی ئاگادارە کەسانێکی وەك تۆ خۆ نادەن بە دەستەوەو گومانیان هەیە لە فەرمایشتەکانی، بۆیە بڕوانە دێڕی (18:18) لە سیفری ئیشتراع کە چ هەڕەشەیەك دەکات، راستەوخۆ ئەمە هاتووە(دەکرێت ئەو مرۆڤەی گوێ لەو فەرمایشتەم ناگرێت کە بە ناوی منەوە دەوترێت من خۆم بەدوایدا دەچم)، لە کتێبی پیرۆزی کاسۆلیکیدا بەم دێڕە کۆتایی پێ دێت (دواتر خۆم دەبمە تۆڵەسێن) ئەمە ترسێنەر نیە؟ خوا هەڕەشەی تۆڵەی کردووە، ئێمە ئەگەر خوێنرێژیێ هەڕەشەمان لێبکات لە پێستی خۆمان دەردەچین، کەچی لە هەڕەشەی خوا ناترسین؟!

موعجیزەی موعجیزەکان

لە دێڕی 19 لە ئیصحاحی 18ی سیفری ئیشتراعدا پێشبینی زیاتری هاتنی پێغەمبەر موحەممەد(ﷺ) بەدیدەکەین، بڕوانە ئەم وشانە (... وەسیەتی چیم پێ کردووە هەمووی دەڵێت پێیان)، جا موحەممەد (ﷺ) وەسیەتی چی پێکراوە؟ ئینجا قورئانی پیرۆزم کردەوەو نوسخەیەکی تەفسیری قورئانیشم کردەوە کە زانای پایەبەرز یووسف عەلی کردبووی، لە سوورەتی ناس لە سەرەتای سوورەتەکەوە نیشانمدا، سوورەتەکانی پێشتریش هەموویان لە سەرەتایاندا هاتبوو (بسم الله الرحمن الرحيم)، پێشبینیەکە چی دەڵێت؟ (وەسیەتی چیم پێ کردووە هەمووی دەڵێت پێیان)وەسیەتەکەی موحەممەد (ﷺ) چیە، ئەوەیە دەفەرموێت(بسم الله الرحمن الرحيم) بۆیە بە تەواوی پێشبینیەکە موحەممەد (ﷺ) دەگرێتەوە، هەموو سوورەتەکانی قورئان جگە لە سوورەتی تۆیەم بە (بسم الله الرحمن الرحيم) دەست پێ دەکەن، موسڵمانیش هەموو کارێکی شەرعی بەو دەستەواژەیە دەست پێ دەکات، لەکاتێکدا مەسیحیەکان بەم دەستەواژەیە دەست پێ دەکەن (بەناوی باوك و کوڕ و ڕۆحی پیرۆز).

بە وردبوونەوە لە سیفری ئیشتراع ئیصحاحی هەژدە، پانزە بەڵگەت پێ دەدەم کە چۆن ئەو پێشبینیە موحەممەد (ﷺ) دەگرێتەوە نەك عیسا (عليه السلام).

# باسی چوارەم

## یووحەننا دژی مەسیح دەوەستێتەوە

دەبینین لە کتێبی عەهدی جەدیددا هاتووە کە هێشتا جوولەکە چاوەڕێن ئەو پێشبینیە بێتەدی (وەك تۆ) کە لە (یوحەننا 1: 19-25) هاتووە، کاتێك عیسا بانگەشەی ئەوەی کرد ئەو مەسیحی جوولەکەیە، جوولەکەکان دەیانپرسی ئەی ئیلیا لەکوێیە؟ چونکە جوولەکە پێشبینییان لابوو کە پێش هاتنی مەسیح سەرەتا ئیلیا لە هاتنی دووەمیدا دێت، عیساش جەخت دەکاتەوە لە بیروباوەڕەکەی جوولەکە: (... سەرەتا ئیلیا دێت و هەموو شتێك دەگێڕێتەوە، بەڵام من پێتان دەڵێم ئیلیا هات و ئەوان نەیانناسیەوە ... ئەوکات خوێندکارەکانی تێگەیشتن ئەو سەبارەت بە یووحەننای موعەمدان قسەی بۆ کردون) (مەتا 17: 11-13)، بەپێی عەهدی جەدید جوولەکە بانگەشەی هەرکەسیان قبووڵ نەکردووە کە بانگگەشەی مەسیح بوونی کردبێت، بۆ ئەوەش نارەحەتی زۆریان چەشتووە تا مەسیحە حەقەکەی خۆیان بدۆزنەوە، ئینجیلی یووحەنناش ئەمە دووپات دەکاتەوە، کاتێك یووحەننا (موعەمدان) دەرەکەوت (ئەوکات جوولەکە لە بەیتولمەقدیسەوە بڕێ قەشەیان ناردن تا پرسیاری لێ بکەن، تۆ کێیت؟ ئەویش هیچ وەڵامی نەدایەوە، بەڵام دانی بەوەدا نا کە ئەو مەسیح نیە) (ئەمە ئاساییە، چونکە ناکرێت لە یەك کاتدا دوو مەسیح هەبێت، ئەگەر عیسا

مەسیح بێت ئیتر یووحەننا مەسیح نیە)، پرسیاریان لێکرد ئەی دواتر؟ تۆ ئیلیایت؟ وتی نا(لێرەدا یووحەننای موعەمدان دژی عیسا دەوەستێتەوە، چونکە عیسا دەڵێت یووحەننا ئیلیا بووەو ئەویش نکوڵی دەکات لەوە، پەنا بەخوا وابێت یەکێك لەو دوانە عیسا یان یووحەننا درۆزن بووە.

بێگومان ئەو راستی وتووە، بە شایەتی خودی عیسا یووحەننا گەورەترین پێغەمبەری بەنی ئیسرائیل بووە (من بەراستی پێتان دەڵێم لەنێو منداڵانی لەدایکبوونی ئافرەتاندا گەورەتر لە یووحەننای موعەمدان نەبووە)، (ئینجیلی مەتا 11:11).

ئێمەی موسڵمانیش یووحەننای موعەمدان بە یەحیا پێغەمبەر دەناسین و بەرزی رادەگرین، چونکە ئەو پێغەمبەرێکی خوا بووە، لای ئێمە یەسووعیش بە عیسا دەناسین و بەرزی رادەگرین و لە پێغەمبەرانی ئولولعەزمی ئەژمار دەکەین، ئیتر ئێمە چ پێویستە و چۆن رەوایە درۆ بدەینە پاڵ هیچکام لەو دوانە، ئەو کێشەی نێوان عیسا و یووحەننا جێدێڵین بۆ مەسیحیەکان تا خۆیان چارەسەری بکەن، لە کتێبە پیرۆزەکاندا چەندین نەگونجان هەن کە قسەی خراپ دەدەنە پاڵ عیسا، ئێمەش موسڵمان گرنگی دەدەین بەو کۆتا پرسیارەی لەلایەن دەستەیەکی هەڵبژاردەی جوولەکەکانەوە ئاراستەی یووحەننای موعەمدان کراوە (ئایا تۆ پێغەمبەریت؟ ئەویش وەڵامی دایەوە نا)، (یووحەننا 21:1).



تکایە ورد بڕوانە، سێ پرسیاری جیاو تایبەت ئاڕاستەی یووحەننای موعەمدان کراوەو ئەویش وەڵامی هەرسێکیانی بە (نا) داوەتەوە، ئەمەش کورتەی سێ پرسیارەکەن:

1- ئایا تۆ مەسیحیت؟

2- ئایا تۆ ئیلیایت.

3- ئایا تۆ ئەو پێغەمبەرەیت.

بەڵام کەسی ڕۆشنبیری مەسیحی هەرچۆنێ بێت تەنها دوو پرسیاریان دەبینێت، دەبێت بزانین جوولەکە سێ پێشبینییات لا هەبووە کە لەکاتی مشتومڕ لەگەڵ یووحەننای موعەمدان ڕایانگەیاندون، جا با لە ڕستەی دواتردا ڕەخنەکەی جوولەکە ببیستین: (دەی ئیتر بۆچی تەعمید دەکەیت ئەگەر تۆ نە مەسیحیت و نەك ئیلیایت و نە پێغەمبەریت؟) (یووحەننا 1:25).

بۆیە جوولەکەل چاوەڕێ بون سێ پێشبینی جیاو تایبەت ڕووبدەن:

یەکەم: هاتنی مەسیح.

دووەم: هاتنی ئیلیا.

سێیەم: هاتنی ئەو پێغەمبەرە.

(ئەو پێغەمبەرە)

ئەگەر تەماشای هەر کتێبێکی پیرۆز بکەین، پێرستێکی ئەبجەدی تێدایە، لە پەراوێزدا تێبینی بۆ وشتەکانی (پێغەمبەر) یان (ئەو پێغەمبەرە) بەدیدەکەین کە لە (یووحەننا 21:1) دا هاتووە، ئەو وشانە دەگەڕێنەوە بۆ پێشبینیەکانی (سیفری تثنیة الإشتراع 18: 15 و 18).

(ئەو پێغەمبەرە) پێغەمبەرێ وەك عیسا (وەك تۆ) بە بەڵگەی روون و یەکلاکەرەوە سەلماندمان کە ئەو پێغەمبەرە موحەممەدە (ﷺ) نەك عیسا.

ئێمەی موسڵمان نکوولّی لەوە ناکەین کە عیسا مەسیحە، ئەو وشەیە وەرگێڕاوی وشەی (کرایست) ە، هەروەها نکوولّی ناکەین لەو هەزار پێشبینیەی لە عەهدی قەدیمدا هەیە سەبارەت بە هاتنی مەسیحی وەك ئەوەی مەسیحیەکان بانگەشەی بۆ دەکەن، ئەو دێڕەی لە (سیفری تثنیة الإشتراع 18: 18) دا هاتووە ناگەڕێتەوە بۆ عیسای مەسیح، بەڵکو پێشبینی و هەواڵێکی روونە سەبارەت بە پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ).

قەشەکە راشکاوانە پێی وتم ئەم مشتومڕە زۆر بەچێژەو زۆری پێ خۆشە رۆژێ بە ئامادەبوونی خەڵکێکی زۆر قسە لەسەر ئەو باسە بکەین، وا دەیەو نیوێك لەو کاتە تێپەڕیو هێشتا من چاوەڕێی ئەو دیدارەم.

من پێم وایە قەشەکە دڵسۆزانە ئەو قسەی کرد، بەڵام مەرگ ڕێگری ئەو دیدارەو هۆکاری ئەو جوداییە بووە.

تاقیکردنەوە:

من بە شوێنکەوتوانی مەسیح دەڵێم: بۆ هەمان ئەو تاقیکردنەوەناکەن کە خودی مەسیح ویستوویەتی پەیڕەوی بکەن لەسەر هەموو کەسێك کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات؟ ئەو دەڵێت (لە ئەنجامیەوە دەیناسنەوە، ئایا پیاو تریێ لە دڕك دەچنێتەوە، یان هەنجیر لە دڕك دەچننەوە؟ دەی هەموو دارێکی پاك بەرهەمی پاك دەدات، هەموو دارێکی پیسیش بەرهەمی پیس دەدات... بۆیە لەرێی ئەنجامیەوە–بەرهەمیەوە– دەیناسنەوە) (مەتا 7: 16–25).

دەی ئێوە بۆ دەترسن ئەو تاقیکردنەوەیە بەسەر ڕێنماییەکانی موحەممەددا (ﷺ) پەیڕەو بکەن؟ ئێوە دەبینن لە عەهدی کۆتاییدا کە خوا ناردوویەتی –قورئانی پیرۆز– پەیڕەوی حەقی ڕێنماییەکانی موساو عیسایە و ئاشتیو بەختەوەری خوازراو بۆ جیهان دێنێ.

(ئەگەر کەسێکی وەك موحەممەد (ﷺ) سەرکردایەتی جیهانی نوێ بگرێتەدەست ئەوە سەرکەوتوو دەبێت لە چارەسەری ئەو کێشانەی هەیەو ئاشتی و بەختەوەری خوازراو بەدیدێنێ)، (جۆرج برناردشۆ).

گەورەترین:

گۆڤاری هەفتانەی (تایم) لە ژمارە پانزەی یۆلیۆی ساڵی 1974ز. دا بڕێ راو بۆچوونی هەڵبژاردەی چەند کەسی مێژوونووس و نووسەر و پیاوی جەنگی و بازرگانو کەسانی دی هێناوە سەبارەت بەوەی کێ گەورەترین کەسی یاسایی بووە لە مێژوودا؟ هەندێکیان پێیان وابوو هیتلەر بووە، هەندێ گاندی و بووزاو کەسانی هاوشێوەی ئەوانیان دانابوو، بەڵام گۆلس مایسرمان کە توێژەرێکی دەروونی ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو پێوەرێکی وردی دانا بۆ پێدانی سیفەتی حەق بەو بوارەو وتی:

دەبێت سەرکردە سێ تایبەتمەندی تێدا بێت:

یەکەم: لە سەرکردایەتیەکەیەوە بەختەوەری بێنێتەدی.

دووەم: کۆمەڵگەیەك دروست بکات کە تیایدا خەڵکی هەست بە ئاسایشی رێژەیی بکەن.

سێیەم: بڕێ بیروباوەڕیان پێ ببەخشێت.

بەو سێ تایبەتمەندیەی پێشوو گەڕا بە مێژوودا و شیکاری کرد بۆ کەسایەتیەکانی هیتلەرو باستۆر و قەیصەر و مووسا و کۆنفۆشیۆش و چەندینی تر، دواجار گەیشتە ئەنجامێکی کۆتایی:

کەسانێکی وەك باستۆر و سۆلك سەرکردەی جۆری یەکەم بون، کەسانی وەك گاندی و کۆنفۆشیۆس لە لایەکەوەو ئەلکسەندەر و قەیصەرو هیتلەر لە لایەکی ترەوە سەرکردەی جۆری دووەم بون، یان لە جۆری سێیەم بون، عیسا و بووزا تەنها تایبەتمەندی سێیەمیان هەبووە.

دەکرێت گەورەترین سەرکردەی هەموو سەردەمەکان موحەممەد (ﷺ) بووبێت کە هەرسێ تایبەتمەندیەکەی هەبووە، بەشێوەیەکی کەمتر لەویش مووسا پێغەمبەر هەمان شتی کردووە، بۆیە بەپێی چەند پێوەرێکی مەوزووعی کە لەلایەن پرۆفیسۆرێکی زانکۆی شیکاگۆ دانرابوو و بڕوام وایە جوولەکەش بوو، عیساو بووزا لە لیستی سەرکردە گەورەکانی مرۆڤایەتیدا ناویان نەهاتبوو، بەڵام گونجانێکی نامۆ لەنێوان مووسا و موحەممەددا (ﷺ) بەدیدەکەین، ئەمە بەڵگەیەکی زیاترە کە عیسا وەك مووسا نەبووە، بەڵام موحەممەد وەك مووسا بووە وەك پێشتر باسمان کردووەو بە وردی لەسەری چوین و بە هەشت خاڵ ئەوەمان سەلماندووە.

جیمس دۆیش لە فەرهەنگی کۆلینز بۆ کتێبی پیرۆز دا بەڵگەیەکی زیاتری بەخشیوە کە عیسا وەك مووسا نەبووە، بەڵام موحەممەد (ﷺ) وەك مووسا بوو (وەك پیاوی دەوڵەت و سەرچاوەی یاساکان مووسا گەورەترینی ناو گەلی جوولەکە بووە)

لە کۆتاییشدا هەڵێنجانێکی مەسیحی دوو دێنم کە لەسەر کتێبی پیرۆز هێناویەتی و بەدوایدا وتەیەکی عیسای مەسیح دێنم:

(سیفەتی حەقیقی پێغەمبەری حەق جیاکردنەوەی رێنماییەکانیەتی بە سیفەتی ئاکارو رەوشتی بالآ)، (پرۆفیسۆر دۆمیلۆ).

(لەرێی ئەنجامیەوە—بەرهەمیەوە— دەیناسنەوە)، (یەسووعی مەسیح).

رێ بدەن بە یەکسانی شیکاری هۆکارەکان بکەین، خوا دەفەرموێت:

﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾ آل عمران: ٦٤.

(ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بڵێ: ئەی خاوەن نامەکان وەرن بۆ لای وتەیەکی ڕاست(یەکسان) لە نێوان ئێمە و ئێوەدا، کە جگە لەخوا نەپەرستین وە هیچ شتێك نەکەین بە هاوبەشی وە هێندێکمان هێندێکمان بە پەروەردگار دانەنێین ئینجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد ئێوەش بڵێن: ئێوە شاهید بن کە ئێمە فەرمانبەرانی خواین.)

نازناوی (ئەی خاوەن پەیامەکان) (يا أهل الكتاب) رێزێکی قورئانی پیرۆزە بۆ جوولەکەو مەسیحیەکان، ئێمەی موسڵمانان لێرەدا فەرمانمان

پێکراوە بە وشەی زانستخواز و خاوەن پەیام ئەهلی کیتاب بانگ بکەین، بڵێین رێ بدەن لە خاڵێکی هاوبەشدا پێك بگەین، ئەویش ئەوەیە تەنها خوا بپەرستین، چونکە هیچ پەرستراوێکی دی نیە شیاوی پەرستن بێت جگە لە خوا، نەك لەبەرئەوەی (خوای تۆ ئەللایە-خوا بەدووورە لەو درۆ گەورەی دەیکەن- خوایەکە حەسوودی هەیە لە دەسەڵاتی باوکان بەسەر نەوەکانی نەوەی دووەم یان سێیەمدا، بۆیە ئەوان رقیانە لێم) (سیفری خروج 5:20) بەڵکو لەبەرئەوەی ئەو خوای بەخشەرو رۆزی بەخش و شیاو بە هەموو سوپاس و ستایش و نوێژ بۆکردن و تەقوایەکە.

لەرووی نەزەریەوە جوولەکەو مەسیحیەکان رازین بە هەموو پێشنیارەکانی ناو قورئان، بەڵام لەرووی پەیرەوەوە شکست دێنن و پێچەوانەی بیروباوەڕی یەکخواپەرستی حەقن، پرسیارێ دەکەم سەبارەت بە پیرۆزراگرتن و رەهبانیەتی قەشەکان (هەروەها لەنێو جوولەکەشدا) هەر لەگەڵ ئەوەی دەبێت بە کاهین یان پاپا یان قەشە یان بەرهەمی ئیتر چۆن دەبێت پێی بوترێت قدیس (بە پیرۆز ناوبردنی) ئیتر بێ گوێدانە زانست و تەقوای، چۆن خێرا دەکرێتە نێوەندی نێوان خواو پەروەردگاری بۆ هەندێ باری تایبەت؟1 ئیسلام دان نانێت بە کەهەنووتدا.

پوختەی بیروباوەڕی ئیسلامی لەم ئایەتەدا دەردەکەوێت:

﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ١٣٦ ﴾ البقرة: ١٣٦.

**(بڵێن:(ئەی موسڵمانینە) بڕوامان هێنا بە خواو بەو قورئانەی کە بۆ خۆمان نێرراوەتە خوارەوە وە بەو نامەیەی کە نێرراوە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و کوڕەکانی یەعقوب وە بەوەی کەدراوە بە مووساو عیساو بەوەی دراوە بەهەموو پێغەمبەران لەلایەن پەروەدگاریانەوە جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ کامێکیاندا وە ئێمە فەرمانبەری خواین)**

**هەڵوێستی موسڵمان روونە، موسڵمان بانگەشەی ئەوە ناکات ئایینێکی تایبەت بە خۆی هەیە، ئیسلام ئایینێکی تائیفی یان رەگەزی نیە، لە دیدی ئیسلامەوە هەموو ئایینەکان یەکن، یەك حەقیقەتیان هەیە:**

﴿ ۞ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحٗا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ كَبُرَ عَلَى ٱلۡمُشۡرِكِينَ مَا تَدۡعُوهُمۡ إِلَيۡهِۚ ٱللَّهُ يَجۡتَبِيٓ إِلَيۡهِ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَن يُنِيبُ ١٣ ﴾ الشورى: ١٣

**(ئەو ئایینەی بۆ داناوون کە فەرمانی داوە بە نووح و ئەوەش نیگامان کردووە بۆ تۆو ئەوەش کە فەرمانمان داوە بە ئیبراهیم و مووسا و عیسا کە**

لەسەر ئەو ئایینە بن بە ڕێك و ڕاستی و جیاوازی تێدا مەکەن زۆر قورس و گرانە بە لای هاوبەش دانەرانەوە ئەوەی ئەوانی بۆ بانگ دەکەیت خوا هەر کەسی بوێ هەڵی دەبژێرێ بۆ (موسوڵمان بوون) لای خۆی وە کەسێك ڕێنموونیی دەکات بۆ لای خوا بگەڕێتەوە).

ئەمە ئەو ڕاستیەیە کە کتێبەکانی سروشی خوایی لەخۆی دەگرن و فەرمان و شەرعی خوایە، ئێمەش دەبێت بە خۆشحاڵیەوە ملکەچی ویست و شەرعی خوا بین، ناکرێت کەسێك واز لە ڕێنوێنی دروستی ڕێنموونی بێنێ و ڕێی ڕاستیش پێشبینی بکات.

# بەشی دووەم

# موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) جێگرەوەی حەقی پێغەمبەر عیسایە

## باسی یەکەم

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ ﴾ الصف: ٦.

(مژدەتان پێ دەدەم بە پێغەمبەرێك كە لە دوای من دێ و ناوی ئەحمەدە)

جێگرەوەیەکی فرەلایەن:

جیگرتنەوە چەندین شێوەی هەیە، بۆ نموونە وەك لە یاسای جوولەکەدا هاتووە ماف لەدایکبوون بۆ منداڵی یەکەمە، یان کوڕە گەورە یان کچە گەورە دەسەڵات دەگرێتەدەست، یان بە هەڵبژاردن و کاندید و دەنگدانی زۆرینە دەبێت، لە زانستی ئایینەکانیشدا بە دیاریکردن و هەڵبژارنێکی خوایی دەبێت کە پێغەمبەران هەڵدەبژێرێت، وەك راسپاردنی ئیبراهیم و مووسا و عیسا و موحەممەد کە هەموویان هەڵبژێران تا وەك پێغەمبەری خوا رۆڵ ببینن.

موحەممەد (ﷺ) لە چەند روویەکەوە جێگرەوەی عیسا پێغەمبەرە:

یەکەم: ریزبەندی زەمەنی، چونکە بەدوای یەکدا هاتون.

دووەم: بەدیهاتنی پێشبینی و هەواڵەکانی پێشوو و دوایی نەك كۆتایی.

سێیەم: هێنانی رێبازی کامڵ و دروست.

(بەرەو حەقیقەت پێشڕەویتان دەکات) (وتەیەکی عیسای مەسیح).

لە رووی مێژووییەوە:

مووسا پێغەمبەر نزیکەی هەزارو سێ سەد ساڵ پێش عیسا پێغەمبەر هاتووە، موحەممەدیش(ﷺ) دوای نزیکەی شەش سەدە دوای عیسا پێغەمبەر هات تا ئەرکی پێغەمبەرایەتی لەئەتسۆ بگرێت.

لە 12 رەبیعولئەوەلی ساڵی فیل یان 29 ئۆگەستسی ساڵی 570ز. دا موحەممەد (ﷺ) لەدایك بوو، ئەوکەسەی شیاوی رێز و پیاهەڵدانە، لە شاری پیرۆزی مەککەو لە نێوەندی عەرەبە بتپەرستەکاندا و لەنێو هۆزی قورەیشدا لەدایك بوو، ئەو ساڵەی تیایدا لەدایك بوو بە ساڵی فیل ناسراوە، چونکە لەو ساڵەدا ئەبرەهەی نوێنەری پاشای حەبەشە لە یەمەن هێرشی برد بۆ حەرەمی مەککەو بە فیلی گەورەوە هاودەم بە سەربازەکانی پێشڕەوی دەکرد، دیمەنی ترس و بیم لە بیرەوەرییاندا نەدەسڕایەوە، هێشتا ئەبرەهە لە لووتکەی سەرکەشی خۆیدا بوو، بەڵام بە لەناوچوونی سوپای ئەبرەهە کۆتایی هات کە موعجیزەیەك بوو و لە قورئانو لە سوورەتی فیلدا تۆمار کراوە: (ألم ترکیف فعل ربك...مأكول) (الفیل: 1-5).

سوننەتی خوایی:

خوای گەورە خۆی پێغەمبەرەکانی هەڵدەبژێت‌و سوننەتی تایبەتی خۆی هەیەو لەوانەیە زۆر جار لە حیکمەتەکانی تێنەگەین، پاول بیردۆزەیەك دەخاتەڕوو:

(جوولەکە داوای نیشانەیەك دەکەن (موعجیزەیەك تا قەناعەت بکەن)، یۆنانیەکانیش بە دوای داناییدا دەگەڕێن)، (کتێبی پیرۆزن کورنپیین 1:22).

پاول پیچی وایە زۆر سەختە جوولەکە لە دانایی تێبگەن‌و بۆ یۆنانیەکانیش گەمژەییە.

خوای گەورە مووسای هەڵبژارد، کەسێك لەدەست دادوەری رایکرد و زمانی تر بوو، کتێبی پیرۆز بە پیاوی (لێو هەڵنەکۆڵراو) ناوی دەبات. (سیفری خروج 6:22).

وێڕای سەختی ئەرکی مووسا بەرامبەر بە فیرعەونی گەورە سەرکەشی ئەو سەردەمە، پەنای بردە بە رەحمەتی پەروەردگاری:

﴿ قَالَ رَبِّ ٱشْرَحْ لِي صَدْرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِيٓ أَمْرِي ﴿٢٦﴾ وَٱحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُواْ قَوْلِي ﴿٢٨﴾ وَٱجْعَل لِّي وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِي ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِي ﴿٣٠﴾ ٱشْدُدْ بِهِۦٓ أَزْرِي ﴿٣١﴾ وَأَشْرِكْهُ فِيٓ أَمْرِي ﴿٣٢﴾ كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا ﴿٣٣﴾ وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا ﴿٣٥﴾ قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ ﴾ طه: ٢٥ ـ ٣٦

(مووسا وتی پەروەردگارم سنگم (دڵ و دەروونم) فراوان بکە، و ئیش و کارم بۆ ئاسان بکە، و گرێی زمانیشم بەرەڵا بکە، بۆ ئەوەی لە قسەکانم تێ بگەن، وە لە خزم و کەسی خۆم کەسێك بکەرە پشتیوانم، کە هاروونی برامە، پشتمی پێ قایم و بەهێز بکە، بیکەرە هاوبەشم لە کارەکەمدا گەیاندنی پەیامی خوا، بۆ ئەوەی زۆر ستایشت بکەین، وە یاد و زیکری زۆرت بکەین، بەڕاستی تۆ بینای بە (هەموو شتێکی) ئێمە، خوای گەورە فەرمووی بەڕاستی ئەوەی داوات کرد پێت درا ئەی مووسا).

## بۆچی (پێدەچی)؟

پاشان عیسا پێغەمبەر هات کە خوا هەڵیبژاردبوو، بەپێی زانیاریەکانی مەسیحیەت هەم خۆی دارتاش بووەو هەم کوڕی دارتاشێك بووە، بەو جۆرەی لە ئینجلدا هاتووە گومان هەیە لە رەچەڵەکی:

(کاتێك یەسووع دەستی پێکرد نزیکەی سی ساڵ بوو، (وەك گومان دەبرێ)[1] کوڕی یووسفە). (لۆقا 23:3).

---

[1] - ئەم دەستەواژەیەی نێو دوو کەوانەکە دەقی نوسخەی مەلیك جیمس و نوسخەکانی رۆمانی کاسۆلیکیە.

یەك ملیارد موسڵمانی ئەمڕۆ ئەوەیان لا روونە کە عیسا بە موعجیزە لەدایك بووەو هیچ پیاوێ باوکی نیە، کەچی شوێنکەوتوانی عیسا دوو رەچەڵەکیان دروستکردووە بۆی کە دەیگەیەننە لای کەسێکی بێ رەچەڵەك و بنەرەت، لە ئینجیلی مەتا و لۆقادا شەش و شەش باوك و باپیر دانراوە بۆ پێغەمبەر عیسا، لەو دوو لیستە جیاوازەدا ناوێکی هابەش لەنێویانیاندا بەدیدەکەین کە ئەویش یووسفی دارتاشە، ئەم ناوە گومانی لەسەرە، چونکە بەپێی لۆقا بێت تەنها (وا گومان دەبرێ) باوکی عیسا بێت.

گومانەکە لای ئوسقوفەکانیش هەیە:

لە راپرسیەکی کتوپڕی ئوسقوفە ئەنگلیکانیەکان لە یۆنیۆی 1984دا دەرکەوت لە کۆی سی و نۆ ئوسقوف سی و یەکیان بڕوایان وایە موعجیزەکانی مەسیح کە بریتیە لە لەدایکبوونی لە مەریەمی عەزرا و زیندوکردنەوەی مردووە، لەوانەیە بە تەواوی بەو چەشنە روونەدابێت کە کتێبی پیرۆز باسی کردووە.

پێچەوانەی ئوسقوفەکانی کلێسای ئینگلتەرا دەبینین کلێسای سکۆتلەندی رێزێکی زیاتری نواندووە بەوەی هەر سەرچاوەیەکی لەدایکبونی مەسیحی لە مەریەم لە زۆربەی چاپکراوە نوێکانیدا سڕیوەتەوە، ئیتر

باسوخواسی موعجیزەکانی مەسیح لەنێو مەسیحیەکانی رۆژئاوادا دەستاودەست دەکرێ نمونەش بۆ ئەمە:

(دەیلی نیوز، دربن، سێ شەممە، 22 مایۆ، کڵێسای سکۆتلەندی بەرواری لەدایکبوون لە مەڵهەمی عەزرا دەسرێتەوە).

خوای گەورە عیسای هەڵبژارد:

هەرچەندە رۆحیەتی عیسا پێغەمبەر پڕبووە لە دانایی رووناکی تەواو، بەڵام نیازی ئەو رێبەرایەتی جیهانە نەبووە، وەك هاتووە:

(ئافرەتێك کە شووشەیەك بۆنی زۆر گانبەهای پێ بوو هات بۆ لای-بۆ لای عیسا- و بۆنەکەی رشت بەسەر سەری عیسادا... بەڵام کاتێك خوێندکارەکانی ئەوەیان بینی بە تووڕەییەوە وتیان ئەو زێدەڕۆییە چیە؟ دەکرا ئەو بۆنەبە نرخێکی بەرز بفرۆشرایە یان بدرایە بە هەژارێ ... -عیسا- بەوانی وت هەژاران هەموو کات لەگەڵ ئێوەدا هەن، بەڵام من هەموو کات لەگەڵ ئێوە نیم) (کتێبی پیرۆز 26: 7-11).

کاتێك نارەحەتی و هەژاری و ئەوپەڕی پێویستی تووش بوو و خۆی راگرت، بە خەفەتەوە هاواری کرد:

(عیسا بەوانی وت: رێویەکان برێ کونیان هەیە، باڵندەکان هێلانەیان هەیە، بەڵام کوڕی مرۆڤ(مەبەستی خۆی بوو) شوێنێکی نیە تیایدا راکشێت) (مەتا 20:8) و (لۆقا 58:9).

وێڕای ئەمەش خوای گەورە عیسای هەڵبژارد، ستایش و گەورەیی بۆ ئەو خوا تاكو تەنهایەی کە جگە لەو کەس غەیبو شاراوەکان نازانێت.

هەڵبژێردراو:

خوا دەفەرموێت:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ۝٢ ﴾ الجمعة: ٢

(خوا ئەو زاتەیە کە ناردوویەتی لە ناو نەخوێندەواراندا (عەرەبەکاندا) پێغەمبەرێك لە خۆیان دەخوێنێتەوە بە سەریاندا نیشانەکانی خوا پاکیان دەکاتەوە وە قورئان و فەرموودەی (پڕ سوود) یان فێر دەکات هەرچەند ئەوان لە مەوپێش لە گومڕایەکی ئاشکرادا بوون.).

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە-بەڵام سەرسوڕمانیشی ناوێ چونکە ویستی خوای گەورەیە- خوای گەورە پێغەمبەرێکی نەخوێندەواری هەڵبژارد بۆ ئوممەتێکی نەخوێندەوار.

(گه‌لێکی هه‌ژار، به‌نێو بیابانه‌کاندا ده‌گه‌ڕان و هه‌ر له‌ سه‌ره‌تای دروستبوونه‌وه‌ که‌س لای نه‌ده‌کرده‌وه‌ به‌لایاندا، پێغه‌مبه‌رێکی پاڵه‌وانیان بۆ نێردرا که‌ وشه‌یه‌کی پێ بوو ده‌کرێت بڕوای پێ بهێنرێت، سه‌یرکه‌ ئه‌وانه‌ی هیچ باس‌و ناوێکیان نه‌بوو ئه‌مڕۆ بوونه‌ته‌ جێی ڕێزی جیهان، که‌مینه‌یه‌ك جیهانێکی گه‌وره‌یان دروست کرد، له‌ماوه‌ی یه‌ك سه‌ده‌دا عه‌ره‌ب له‌ لایه‌که‌وه‌ گه‌یشته‌ غه‌رناته‌(ئیسپانیا) و له‌ولاشه‌وه‌ گه‌یشته‌ دلهی (هیند)، له‌به‌ر دلێری و ناوازه‌یی و ڕووناکی هه‌ڵکه‌وته‌یی، عه‌ره‌ب ماوه‌ی چه‌ندین سه‌ده‌ ڕووبه‌رێکی زۆر و فراوانی جیهانیان به‌ده‌سته‌وه‌ بوو، به‌هۆی ئیمانێکی گه‌وره‌وه‌ که‌ هه‌یانبوو ژیانیان پێ به‌خشرا و مێژووی ئوممه‌ته‌که‌ به‌رهه‌مدار بوو و به‌ په‌یدابوونی ئیمان خێرا گه‌وره‌ییان ده‌ستکه‌وت، ئه‌و عه‌ره‌بانه‌و ئه‌و پیاوه‌ گه‌وره‌ موحه‌ممه‌د (ﷺ) توانییان له‌ ماوه‌ی یه‌ك سه‌ده‌دا وه‌ك مۆمێك وابن که‌ جیهانی تاریکییان ڕووناك کرده‌وه‌، جیهانێ له‌نێوه‌ندی لمدا که‌ که‌س لای به‌لادا نه‌ده‌کرده‌وه‌، چه‌نده‌ عه‌جیبه‌ ئه‌و لمه‌ سه‌لماندی ته‌واوه‌یه‌کی ته‌قینه‌وه‌یه‌و ئاسمانی له‌ دلهیه‌وه‌ تا غه‌رناته‌ ڕووناك کرده‌وه‌، ئه‌و پیاوه‌ گه‌وره‌ هه‌میشه‌ وه‌ك ڕووناکیه‌کی پرشنگداری نێو ئاسمان ده‌مێنێته‌وه‌، پیاوانی تریش وه‌ك سووته‌مه‌نی ده‌وری وابوون، ئینجا ئاگرێکی گه‌وره‌و ناوازه‌یان هه‌ڵگیرساند).

ئەمە کۆکراوەی وتەیەکی تۆماس کارلایل بوو کە یەکێکە لە گەورە بیریارەکانی سەدەی پێشوو، لە رۆژی هەینی هەشتی مایۆی ساڵی 1984 ز. دا لەژێر ناونیشانی (پێغەمبەری پاڵەوان) ئەم وتەی پێشکەش کرد، جەماوەری ئامادەبوویش لە ئەنگلیکانیەکان بوون (مەسیحیەکانی ئینگلتەرا).

گەلی هەڵبژێردراو:

خوای گەورە پێغەمبەرانی هەڵدەبژێرێت، خوا گەلی پێغەمبەرانیش هەڵدەبژێرێت، لە جیهانی رۆحانیەتدا ئەوەی جوولەکە چەشتوویەتی هیچ ئوممەتێکی دی نەیچەشتووە، هەرچەندە مووسا لەنێو گەلەکەیدا هاواری کرد (لەو رۆژەی ئێوەم تێدا ناسیوە ئێوە هەر لە فەرمانی خوا دەرچوون) (سیفری تثنية الإشتراع 24:9).

لە وەسیەت و عەهدی ئەخیری مووسادا هاتووە کە ئیسرائیلیەکان ئەو پێغەمبەرە لەسەرخۆ و نەموونیانەی خۆیان هێندە ماندوو کرد کە لەتاو ملەجێرەی بەردەوامی ئەوان و ئاکاری لاساریان بەرامبەر بە ویستی خوا ناچاریان کرد بە تووڕەیی : (لەبەرئەوەی ئاگادارم بە سەرکەشی و ملەجێرەییتان هەرچەندە هێشتا تا ئێستاش خۆم لەگەڵتاندام و زیندووم، ئێوە هەر لە خوا یاخی دەبن، جا دوای ئەوەی دەمرم چیتان لێ بێت) (سیفری تثنية الإشتراع 27:31).

ئەی هاوار بۆ راستی ئەم دەقە! من موناقەشەی ویستی خوا ناکەم، بەلآم راستەوخۆ لە ئیصحاحی دواتردا تووڕەیی خوا زیاد دەکات وبە توندی رەخنە لە جوولەکە دەگرێت:

(سیفەتی حەسوودییان داوەتە پاڵم کە هی خوا نیە، ئەوان – جوولەکە– بەو بەخۆدانازینەی هەیانەو هیچ هۆکارێکی نیە منیان تووڕە کردووە، لەمەودوا وایان لێدەکەم غیرە بکەن لەوانەی کە مرۆڤ نین و وایان لێدەکەم لە ئوممەتی پەست و نزم تووڕە بن)، (سیفری تثنیة الإشتراع 27:32).

پەیلی جوولەکە:

هەرکەس سووکە زانیاریەکی هەبێت بە کتێبی پیرۆز، دەزانێت جوولەکە رەگەزپەرستە خۆبەزلزانەکان مرۆڤ نین‌و هیچ و پەستن لەئاست ئامۆزا ئیسماعیلەکانیاندا، واتە ئەو عەرەبانەی کە تۆماس کارلایل باسی کردون (لە بیاباندا دەگەڕان‌و لە دروستبوونی جیهانەوە هیچ باسێکیان نەبوو).

عەرەب: ئەسکەندەری گەورە بەلایاندا تێپەڕ بوو، فارس دایان بەلایاندا، میصریەکان دایان بەلایاندا، رۆمانەکان بەلایاندا تێپەڕ بوون، عەرەبیش هێندە لاواز بوون دەکرا هەر گەل و دەستەیەك زاڵ بێت بەسەریانداو

ناوچەکەیان داگیر بکات، بەڵام ویستی خوا وابوو تەنها بەلایاندا تێپەڕ بن، لەنێو کانگای تاریکیەکانەوە ئەوانی دەرکرد تا ببنە چرای زانستو ڕووناکی بۆ جیهان، (وایان لێدەکەم –جوولەکە– غیرە بکەن).

نەخۆشی غیرە بۆماوەییە، باسمان کرد کە سارەو هاجەر هەردووکیان ژنی ئیبراهیمی خەلیلوللاه بوون، غیرەی سارە بە میراتی مایەوە بۆ منداڵو نەوەو هۆزەکانی دوای خۆی.

ماوەیەك لەمەوپێش کتێبێکم خوێندەوە سەبارەت بە دۆزینەوەکانی داوودی پزیشك (کە جوولەکە بووە) بۆ نەگبەتی ناوی نووسەرەکەم بیر نایەت و نەشمتوانی کتێبەکە بەردەست بخەمەوە، بەهەرحاڵ وشەی وەسفو پیاهەڵدانی ئەو کابرا جوولەکەیە بۆ ئامۆزا ئیسماعیلیەکانی (عەرەب) دادەبارێت، ئەمە دیدێکی چەسپاوی لا پەیدا کردم، نموونەیەك دێنمەوە: (شوانی بزنو وشترەکان دەچنە سەر کورسی قەیصەرەکان).

وێڕای ئەو هەموو کینەو حەسوودیە ئەمەی چۆن دروستە؟ ئەمە ویستی خوایە، خۆی گەورەیی دەبەخشێت بە هەرکەس بیەوێت، ئەمەش نیشاندەری گەرەیی خوایە:

﴿ وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ يَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمۡثَٰلَكُم ﴿٣٨﴾ ﴾ محمد: ٣٨

(ئەگەر ئێوە پشت هەڵکەن ئێوە دەگۆڕیێ بە کەسانێکی تر (ی زۆر چاك) کە وەکو ئێوە نابن.)

(بە دڵنیاییەوە عەرەب لە گەورەترین موعجیزەکانی مێژوون، هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) توانییان تەنها لە ماوەی چەند دەیەیەکی کەمدا ژیارێکی ناوازەی وا دروست بکەن کە لە هەرەمەکانی میصرەوە دەگەیشتە دەرگاکانی چین) (عەبدولوەدوود شلبی: الاسلام دين الحياه).

کۆتا پێداری:

بەدیهاتنی پێشبینی پێغەمبەر عیسای مەسیحمان سەلماند وەك کۆتا پێغەمبەری گەورەی جوولەکە کە هەواڵی داوە جوولەکە دەستبەرداری رێبەرایەتی رۆحی مرۆڤ دەبن، ئەمەش لە هەمان وتەکانی مامۆستادا کە هاتووە (بۆیە پێتان دەڵێم(جوولەکەل) شانشینی خوا لە ئێوە دەسەنرێتەوە(جوولەکە) وە دواتر دەدرێت بە ئوممەتێك کە بەرهەم لەوە دەچنێتەوە) (مەتا 43:21).

# باسی دووەم

## لە وتەکانی مامۆستا (تەنها یەك پێغەمبەرایەتی تەواو

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ ﴾ الصف: ٦

(بیر بکەرەوە کاتێك کە عیسای کوڕی مەریەم وتی ئەی کوڕانی یەعقوب بێگومان من نێردراوی خوام بۆ لای ئێوە ئەو تەوراتەی کە لە پێش مندا هاتووە بەڕاستی دائەنێم وە مژدەتان پێ دەدەم بە پێغەمبەرێك کە لە دوای من دێ و ناوی ئەحمەدە)

سیفەتێکی هاوبەش

بە چاوخشاندنێکی خێراو خوێندنەوەیەکی بەپەلە بۆ ئەم ئایەتەی پێشوو، موسڵمانان قەناعەت بەوە دەکەن کە عیسا پێغەمبەر هەواڵی هاتنی موحەممەدی پێغەمبەری خوای (ﷺ) داوە، موسڵمانان سەریان سوڕدەمێنێت لە دیدی خۆبەزلزانی و نکووڵی و زبری مەسیحیەکان کە ناهێڵێت رووناکی درەوشاوەی موحەممەد (ﷺ) ببینن و گوێ بگرن لەو

هاوارەی لە ویژدانێکی زیندووەوە دێت، ئەمان بە روونی ئەمە جیا ناکەنەوە، مەسیحیەکان لە دڵرەقی و نکووڵی کردندا هەمان رۆڵی جوولەکە دووبارە دەکەنەوە، ئەو ئوممەتە گەورە هەڵکەوتەیە وێڕای بوونی هەزاران پێشبینی و هەواڵ لە کتێبە پیرۆزەکەیاندا (عەهدی قەدیم) سەبارەت بە هاتنی مەسیح، کەچی هێشتا تەواو ئامادە نەبوون ئەو گەورە رزگارکەرەیان جیا بکەنەوە، دەی ئایا هەردووکیان لە ئاست هەندێ شت چاویان داناخەن؟

نا، جوولەکەو مەسیحیەکان بە ئەنقەست حەقیقەت ناشارنەوە، کێشەکە لەوەداین ئێمە هەموومان هەر لە منداڵیەوە برێ چەمك وەردەگرین و ئەمریکیەکانیش پێی دەڵێن بەرنامەرێژی.

بە خوێندنەوەیەکی ساکار بۆ ئایەتەکان یان گوێ گرتن لە وانەکان یان نازین بە مەعریفەو زانست، نابێتە هۆکارو هاوکاری بڵاوکردنەوەی حەقیقەت، ئەم سەردەمە بریتیە لە سەردەمی (هەموان پیاون)، سەردەمی پیشەگەران تەواو بوو، ئەرکی هەموو تاکێکی موسڵمانە بە پێی توانای خۆی بڵاوی بکاتەوە.

ئەو ئایەتەی پێشوو لەگەڵ تەفسیرو واتاکەیدا هاودەم بە بەڵگەکانی پێشوو و ئەوانەی دواتریش لەبەر بکە، بەمە دەتوانین ئایینەکەمان بگەیەنین بە ناموسڵمانان، ئەمە رێی بانگەوازی ئێمەیە کە پیایدا تێپەڕ دەبین.

بەڵگەی خۆت بدۆزەرەوە:

لەوانەیە ئەمە یەکەمجار نەبووبێت کە تیایدا پێشبینیەکانی ناو کتێبە پیرۆزەکانی جوولەکەو مەسیحیەتت خوێندبێتەوە یان بیستبێت سەبارەت بە هاتنی کۆتاو سەرمۆری پێغەمبەران موحەممەد(ﷺ)–کە رەحمەتە بۆ هەموو مرۆڤایەتی–، لەوانەیە چەند جارێ هەوڵێکی کزو لاوازت دابێت تا ئەو پێغەمبەرە بناسیت کە لە کتێبی پیرۆزدا باسی کراوە، لەبەرئەوەی هیچ بەڵگەیەکت پێ نیە بۆیە هەوڵێکی خێزانیت نەداە، بشزانە هیچ بەدیلێك نیە بۆ هەوڵی سەخت و ورد، من بڕوام بەو قسەی خۆم هەیەو کاری پێ دەکەم و پشت بەخواش بانگەوازی بۆ دەکەم.

من خۆم هەڵبژاردەیەکی ناو کتێبی پیرۆزم بە چەند زمانێکی جیاواز لەبەرکردووە، لەوانە بە زمانەکانی عەرەبی و عیبری، ئەمە بۆ کەشوفش ناڵێم، بەڵکو بۆ کرانەوەی ئاسۆیەکی فراوانتر لە بانگەواز بۆ دین و بیروباوەڕ بە چەند زمانی جیاواز، چونکە زمانەکان کلیلی دڵی خەڵکن.

لە وڵاتی فیرعەونەکاندا

وێڕای هەموو وردەکاری و رەچاوێك، لە قاهیرە وەستێنرام لەبەرئەوەی ڤیزای چوونەژوورەوەم نەبو، لەوێ زانایەکی ئەزهەر هەوڵی دا یارمەتیمان بدات تا بەڵگە پێویستەکان دابین بکەین، بەڵام لەبەرئەوەی دواکەوتین و

ئەویش دەبوو ئامادەی نوێژی هەینی بێت، بۆیە منو یووسفی کوڕمی دایە دەست ئافرەتێکی کەشخەی میصری کە جلی ڕۆژئاوایی لەبەربوو.

پاش هەوڵێکی زۆر و وەستانێکی دوورودرێژ هاتەوە بۆ لامان و هەواڵی خۆشی پێ بوو، وتی چل دۆلار دەکات، وتم بۆ چی شتێك؟ وتی بۆ ڤیزاکە، بیست دۆلار بۆ خۆم و بیست دۆلاریش بۆ یووسفی کوڕم، منیش وتم بەڵام خۆ من میوانی حکوومەتم، ئەویش وتی حکوومەت هیچ لەمە نازانێت، منیش زەردەخەنەیەکم کرد و پارەکەم پێدا.

له وتەو ئاکارەکانی ئەو خاتوونەوە هەستم بەوە کرد مامۆستاو ڕۆشنبیرە، منیش جارێکی تر بێ ترس بە عەرەبیە کرچو کاڵەکەم پرسیاری ناویم کرد، بەڵام ناوەکەی بۆ من نوێ بوو و نەمئەتوانی لەبەری بکەم، بۆیە ئەمجار پرسیم ئەرێ تۆ موسڵمانیت؟ ئەویش وتی نا، من کچە میصریەکی مەسیحیم، ئەمە کلیلی چاوەڕوانیەکەی من بوو، منیش وتم ئەی دەزانیت پێش ئەوەی عیسا ئەم جیهانە جێبهێڵێت هەواڵی داوە بە شوێنکەوتەکانی؟) ئینجا بەڵگەم هێنایەوە، بەڵام ئەمەیان بە عەرەبیەکی رەوان ئایەتێکی کتێبی پیرۆزم بە زمانی عەرەبی بۆ خوێندەوە کە بۆ بارو شوێنی وا لەبەرم کردبوو: (بەڵام من حەقتان پێ دەڵێم، باشترە بۆتان من بەڕێبکەوم، چونکە ئەگەر من نەچم ئەوە هەرگیز موعزی(ئارامبەخش) نایەت بۆ لاتان، بەڵام ئەگەر بچم ئەوە دەینێرم بۆتان) (یوحەننا 7:16).

وەرگێڕان:

پێویستی نەئەکرد دێڕەکەی بۆ وەرگێڕم، چونکە ئەو وەك عەرەبێك بە تەواوی لە دەقەکە تێدەگەیشت، بەڵام بۆ ئەوانەی عەرەبی نازانن هاوواتای ئەو وشەتان بۆ دێنم لە کتێبی پیرۆزی ئینگلیزیدا کە زۆر هەوڵمدا تا لەبەری بکەم و کاتی بۆ پەیدا بکەم، تۆیش کاتت دەبێت ئەگەر خۆشەویستیت هەبێت بۆ ئاینی خواو حەز بکەیت لەنێو خەڵکیدا بڵاوی بکەیتەوە.

ئارامبەخش

داوا لەو برایانەم دەکەم کە دەتوانن دەقی عەرەبی بخوێننەوە لەگەڵ وەرگێڕانەکەیدا لەبەری بکەن و دەرفەتیان دەست کەوت بەکاری بهێنن، ئەمەش سوودێکی زۆری هەیە بۆ دەربڕینی زمانی ترو بانگەوازی خەڵك بۆ ئیسلام، وشەی (comforter) بە عەرەبی واتای موعزی(ئارامبەخش) دەگەیەنێت، جا پرسیارم کرد لەو خاتوونە لەو پێشبینەی کە لەو دەقەی کتێبی پیرۆزدا هاتووە موعزی کێیە؟ ئەویش وتی نازانم، ئافرەتێکی پاك بوو و هەوڵی خۆدزینەوەی نەدەدا، منیش وتم ئێمە لە قورئاندا پێمان وتراوە عیسای مەسیح هەواڵی داوە بە شوێنکەوتەکانی ﴿ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ ﴾ الصف: ٦.

ئینجا قسەکەم تەواو کرد:ئەحمەد ناوێکی تری موحەممەدە(ﷺ)، موحەممەدیش موعزیە، ئافرەتەکەش بە سەرسوڕمانەوە وتی زۆر جێی سەرسوڕمانە، ئەی ئەم میصریانە–مەبەستی میصریە موسڵمانەکان بوو– دەمانبەن بۆ سینەماو سەمامان پێ دەکەن–مەبەستی ئافرەتە مەسیحیەکان بوو– کەچی هەرگیز ئەمەیان پێ نەوتوین.

خوای گەورە چل جونەیهی کرد بە هۆکار تا ئەو دەقە بەکاربهێنم، ئایا وەك پێویست توانیومە بەکاری بهێنم!

راڤەی من بۆ ئەو موعزیە کە لە یوحەننا(7:16) دا هاتووە ئەوەیە کە هەمان ئەحمەد–موحەممەد–ی قورئانی پیرۆزە کە باسکراوە، پشت بەخوا لە شوێنی خۆیدا بە وردی باسی دەکەین.

## جەختکردنەوەی کتێبی پیرۆز:

وابزانە سەدەی شەشەمی زاینیە، کاتێك موحەممەد (ﷺ) فەرمایشتەکانی خوای دەخوێندەوە (وتەم دەخەمە ناو دەمیەوە)، هێشتا کتێبی پیرۆز وەرنەگێردرابوویە سەر زمانی عەرەبی و پێغەمبەریش(ﷺ) نەیدەزانی خەریکە دەقاودەق وتەی عیسا پێغەمبەر دێنێتەدی.

تەنها بۆ ئیسرائیلیەکان:

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَـٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ﴾ الصف: ٦

(بیر بکەرەوە کاتێك کە عیسای کوڕی مەریەم وتی ئەی کوڕانی یەعقوب بێگومان من نێردراوی خوام بۆ لای ئێوە ئەو تەوراتەی کە لە پێش مندا هاتووە بەڕاستی دائەنێم).

عیسا تەنها بۆ جوولەکە هاتووە:

(ئەو دوانزە کەسە عیسا ناردنیو فەرمانی کرد پێیان و وتی لە رێی جگە جوولەکەدا مەڕۆنو مەچنە هیچ شارێکی سامریەکان، بەڵام-لەوپەڕی راستیدا- بڕۆن بۆ بیر فەوتاوەکانی ماڵە ئیسرائیلیەکان) (مەتا 10: 5-6).

بۆ سەگەکان نیە:

(تەماشای ئافرەتێکی کەنعانی[1] دەکرد کە هات... بە دەنگی بەرز دەیوت رەحمم پێ بکە... کوڕەکەم باری زۆر خراپە شەیتان دەستی لێ وەشاندووە، بەڵام ئەو بە یەك وشەش وەڵامی نەدایەوە، شوێنکەوتوەکانی هاتن بۆ لایو تکایان لا کرد و وتیان لای بەلادا بکەرەوە وا بەدوامانەوەیەو دەقیژێنێ، ئەویش وەڵامی دایەوە من تەنها بۆ بزر فەوتاوەکانی ماڵە ئیسرائیلیەکان نێردراوم، بەڵام ئافرەتەکە هاتو لەبەردەمیدا چۆکی داداو وتی ئەی گەورە یارمەتیم بدە، ئەویش وەڵامی دایەوەو وتی دادپەروەری نیە نانی منداڵان هەڵگریت و فرێی دەیتە بەردەم سەگەکان) (مەتا 15: 22–26).

ئەوە ئاینی پێغەمبەرێکی جوولەکەیەو پەیڕەوی بانگەوازەکەی دەکات، لە ژیانی خۆیدا یەك کەسی جگە جوولەکە نەچوویە ناو ئاینەکەیەوە، حەواریە هەڵبژێردراوەکانیش(دوانزە شوێنکەوتەکەی) هەموویان سەر بە هۆزەکەی خۆی بوون، بۆیە لەوانەیە بکرێت پێشبینیەکانی تری بێنەدی(هەرکات کوڕی مرۆڤ–عیسا پێغەمبەر– لەسەر کورسی شکۆی دانیشت، ئێوەش(شوێنکەوتەکانی– لەسەر دوانزە کورسی دادەنیشن، دوانزە هۆزەکەی ئیسرائیل دەنوێنن) (مەتا 19: 28).

[1] - لە مەرقەس 7: 26 دا هاتووە ئافرەتەکە یۆنانی بووە.

ئایینێکی نوێ نیە:

خوا دەفەرموێت(مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ) (الصف: 6).

مەسیح پێغەمبەرێکی زمانشیرین نەبوو لەنێو جوولەکەدا وەك ئەمووس و حیزقیال یان ئیسحاق و ئیرمیا، بەڵکو زۆر روون ئیدانەی دووڕوویی و هەڵسوکەوتەکانی جوولەکەی دەکرد، ئسلوب و خەباتە بانگەوازیەکەی گومانێکی گەورەی لای شوێنکەوتوانی ئایینەکەی دروست کرد، جار دوای جار دەهاتن تا تاقی بکەنەوەو بزانن راست دەکات، تا ئەو گومانەیان بڕەوێتەوە کە ئەو ئایینێکی نوێی هێنابێت و دڵنیا بن دان دەنێت بە هەموو رێنماییەکانی پێش خۆیدا، ئەویش دەیوت: (واگومان مەبەن من هاتوم تا ناموس یان پێغەمبەران هەڵبوەشێنمەوە–پەیامیان لەکاربخەم–، من حەقتان پێ دەڵێم، تا ئەو کاتەی ئاسمان‌و زەوی ئاوا دەبێت یەك پیت یان یەك خاڵ لە ناموس ئاوا نابێت تا هەموو دەبێت، هەرکەس یەکێك لەو وەسیەتە بچووکانە هەڵبوەشێنێتەوەو وا خەڵك فێر بکات، لە مەلەکووتی ئاسمانەکاندا بە بچووکترین ناودەبرێت، هەرکەسیش کاریکات و بزانێت ئەوە لە مەلەکووتی ئاسمانەکاندا بە گەورە ناودەبرێت) (مەتا 5: 17–19).

ئەو دەستەواژەیە (ﷺ) کە لە شەش وشە پێکدێت لەگەڵ سێ دێڕی سیفری مەتا لە سەرەوە بەراورد بکە، ئینجا تێبینی ئەوە دەکەیت هیچ

درێژکردنەوەیەك نیە لە ئسلووبی قورئانیدا، ئەمەش ڕەنگدانەوەی پەیامی خوایە بە پوختی و روونی و وردی.

(باوکی[1] حەق پێغەمبەرەکانی هەڵدەبژێرێت، بە دەنگێکی بەهێزتر لە دەنگی هەورەگرمە قسەیان بۆ دەکات) (سعيد أمين علي: روح الاسلام)، قورئانی پیرۆز مەسەلەکە روون و راست دەکاتەوەو سروشی خوایی بە کەماڵ دەگەیەنێت یان ئەوەی لە دەستی ناسپاردەکاردا هەیە بە کۆتا دەگەیەنێت.

خوا دەفەرموێت:

﴿ وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾ يونس: ٣٧

(ڕەوا نی یە و ناگونجێ ئەم قورئانە هەڵبەسترا بێ (لە لایەن کەسێکەوە) جگە لەخوا بەڵکو بەڕاست دانەری ئەو (کتێبانەی) پێش خۆیەتی وە ڕوونکردنەوەی کتێبە ئاسمانیەکانە هیچ گومانی تێدا نی یە لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە هاتووە.).

---

[1] - وشەی باوك لە فەرهەنگی مەسیحیەتدا بەکاردێت و مەبەست پێی خوای گەورەیەو لە نێو چەمکە ئیسلامیەکاندا بەکارهێنانی قەدەغەیە تا پشێوی هزری نێو مەسیحیەکان نەیەتە نێو موسڵمانان.

هەواڵی جوان:

خوای گەورە دەفەرموێت

﴿ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ ﴾ الصف: ٦.

پۆزش ناهێنمەوە بۆ ئەوەی دەقاودەق وەرگێڕاوی عەبدولا یووسف عەلی دادەنێم بۆ وشەی ئەحمەد کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، بەلام پێش ئەوە ریّ بدەن هەلّێنجانێکی کۆڕبەندی مەلیك فەهد بۆ چاپی قورئانی پیرۆز لە مەدینەی مونەووەرە بهێنم(ئەم کۆڕبەندە ملیۆنەها نوسخەی قورئان هاودەم بە تەفسیری بە زمانی جۆراوجۆر چاپ دەکات) ئەو کۆڕبەندە بۆ نوسخە ئینگلیزیەکە پشتی بەستووە بە تەفسیرەکەی یووسف عەلی و هەمدی چاپی دەکەنەوە، ئەمە وتەی کۆڕبەندەکەیە:

(پێشتر هەندێ کەس واتاکانی قورئانی پیرۆزیان وەرگێڕاوە، بەلام بە گشتی کارەکانیان هەوڵی تاکەکەسی بون و زیاتر دەربڕی دیدی خۆیان زالّ بووە، لەبەر بوونی تەفسیری جێمتمانەی دوور لە مۆرکی شەخصی بڕیاری پاشایی (ژمارە 19888 لە بەرواری 16-8-1400کۆچی) لەلایەن خادیمولحەرەمین مەلیك فەهدی کوڕی عەبدولعەزیزەوە دەرچوو کە لەو کاتەدا جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بوو... کۆتا تەفسیری عەبدولا یووسف عەلی هەلّبژێررا، ئەمەش لەبەر سیفەتە تایبەتیو ناوازەکانی).

زیاد لە شەش هەزار پەراوێزی تەفسیری لە تەفسیرەکەی یووسف عەلیدا هەن، ئەوەی لێرەدا باسی دەکەین تەنها یەکێکە لەو سێ تەفسیرەی کراوە بۆ ئە وپێشبینیەی فەرمایشتەکانی عیسای هێناوە سەبارەت بە هاتنی موحەممەدی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

ئەحمەد یان موحەممەد وەرگێڕاوی وشەی یۆنانی (بیراکلیتۆس)ن، لە ئینجیلی نوێی یوحەننا(14: 16 و 15: 26 و 16: 7) دا وشەی ئارامبەخش(موعزی) لە نوسخە ئینگلیزیەکەدا دەبینین کە هاوواتای وشەی بیتراکلیتۆسە کە واتای پارێزەر دێت و ئەو کەسە دەگرێتەوە کە بانگهێشت دەکرێت بۆ هاوکاری کەسێکی تر وەك هاوڕێی دۆستانە، مامۆستاکانمان جەخت لەوە دەکەنەوە بیراکلیتۆس شێواندنی بنەرەتی وشەکەیە و وتەی سەرەکی عیسا لەو پێشبینیەدا پێغەمبەری پیرۆزی خۆمانە کە ئەحمەدی ناوە، تەنانەت کە بیراکلیتۆس دەخوێنینەوە، ئاماژەیە بە پێغەمبەری ئازیزمان کە رەحمەتە بۆ جیهانیان (رحمة للعالمين)و بۆ باوەڕداران زۆر بەخشندەو میهرەبانە (بالمؤمنين رؤوف رحيم).

خوای گەورە دەفەرموێت (فلما جاءهم بالبينات قالوا هذا سحر مبين) (الصف: 6).

(لە چەند رێوە هەواڵی هاتنی پێغەمبەری ئیسلام دراوە، کاتێك ئەو پێغەمبەرە هات چەندین بەڵگەی روونی نیشاندا، هەموو ژیانی لە سەرەتاوە

ـ كوتایی موعجیزەیەكی گەورە بوو، دژ بە دوژمنان جەنگاو سەركەوت، بێ ـەوەی هیچ مرۆڤێ فێری بكات گەورەترین دانایی فێر بوو، دڵە ڕەقەكانی ـرـەوەو دڵە لاوازەكانی بەهێز كرد، لە هەموو وتەو كردارە ناوازەكانیدا ـوـو دەسەڵاتی خوا بەدیدەكەیت، لەگەڵ ئەوەشدا دەبینیت كەسانی گومانساز ئەمە بە جادوو و كەهانەت ناودەبەن)

(درۆزن یان جادووگەر! نا نا، ئەو دڵە بەجووڵەو بەجۆشە كە دەڵێیت ـەنوورێكی گەورەی بیوباوەڕە هەرگیز جادووگەر نەبووە) (تۆماس كارلایل: ـەوانان و پاڵەوانێكی بەرزراگر، ص 88).

بەدیهاتنی پێشبینیەكەش بە جادوو و كەهانەت ناو دەبەن، ئەمەش ـاتر شێواندنی مێژووی مرۆڤایەتیە.

## باسی سێیەم: موحەممەد (ﷺ) هەمان براکلیتە

بۆ ئەوانەی دڵسۆزانە بەدوای حەقیقەتدا دەگەڕێن، دیارە موحەممەد (ﷺ) هەمان براکلیتی بەڵێن لەسەردراو یان هەمان موعزیە یان هەر ناوێکی تری بەدیلی وەك هاریکار یان پارێزەر یان ئامۆژگاریکەر یان..هتدە کە لە پێشبینیەکانی عیسا پێغەمبەر لە ئینجیلی قەشە یووحەننادا هاتووە، ملیۆنەها مەسیحی لە ژنو پیاو هەن وەکو خاتوونە بەرێزەکەی فرۆکەخانەی قاهیرە کە پێشتر باسمان کردتینووی ئەو پیامە ساکارو روونەن، بەلام بەداخەوە (بەرهەم چنینەوە زۆرەو ئیشکەر کەمن) (مەتا 9: 37).

### زمانی عیسا پێغەمبەر:

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ناوی ئەحمەدی وەك ناوێکی تری موحەممەد هێناوە کە لەسەر زمانی عیسا پێغەمبەر ئەو ناوە هاتووە، ئەو مەسیحیانەی ناکۆکی دەنێنەوەو کتێبی پیرۆز تۆمەتبار دەکەن هەموویان گاڵتە بە سروش دەکەن، هیچکام لە موژدەبەرە مەسیحیەکان نکوڵی ئەوە ناکەن غیسا پێغەمبەر هەواڵی هاتنی کەسێکی دوای خۆی داوە، بەلام بۆ ئەوەی ناوی ئەحمەد بێت لە دیدی ئەوانەوە ئەگەرێکی دوورە.

ئەو ناوەی زیاتر لای مەسیحیەکان جێی قبووڵەو بڵاوە بریتیە لە موعزی–ئاسوودەبەخش– ئەمەش راستیەکە واتاکە ناگۆڕێت، ئیتر ئەو ناوەی لیّ بنێین یان هەر ناوێکی تری هاوواتای، ئێمە پشت دەبەستین بە وشەی موعزی بەو چەشنەی لە نوسخە وەرگێردراوەکانی کتێبی پیرۆزدا هاتووە– نوسخەی مەلیك جیمس–، پرسیار لە بەرامبەرەکەت بکە ئایا عیسا بە زمانی ئینگلیزی قسەی کردووە؟ بە دڵنیاییەوە هەر مەسیحیەك پێت دەڵێت نەخێر، بلێ ئەی بە عەرەبی قسەی کردووە؟ یان هەواڵی داوە بە هاتنی ئەمسۆکۆزس کە بە زمانی زولوو بریتیە لە ئاسوودەبەخش یان ترووستەر کە لە کتێبی پیرۆزی ئەفریقیدا هاتووە؟ هەمدی وەڵامەکەت نەخێر دەبێت، مەسیحیەکان مافی خۆیانە شانازی بەوەوە بکەن وەرگێڕانی تەواوی کتێبی پیرۆزیان بە سەدان زمانی جیاواز هەیە، عەهدی جەدیدیشیان بە زیاتر لە دووهەزار زمانی جیاواز هەیە، کەسی مەبەستی هەڵکەوتە زیاد لە دوو هەزار ناوی جیاوازی بە دووهەزار زمانی جیاواز داناوە بۆ ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوانکراوە.

بنیۆما: رۆح

ئەبە مەسیحیەکان بە وەرگێڕانی ناوی خەڵکی بە هەڵە نەخۆشییان بڵاو کردوەتەوە، بۆ نموونە عیسایان وەرگێڕاوە بە جیسس، مەسیحیان وەرگێڕاوە بە کرایست، بوتروسیان وەرگێڕاوە بە پیتەر، دەیانی تری ئاواش.

هەرکەسێ نزیك بێت دەتوانێت دەربڕینی ئەسڵی وشەی عیسا لە کتێبە پیرۆزەکاندا بەدەستبخات کە بریتیە لە بارکلیتس، هەندێ جار ئەوەش بەرپەرچ دەدرێتەوە لەبەرئەوەی مەسیح بە یۆنانی قسەی نەکردووە، بەڵام رێ بدەن زۆر رەق نەبین‌و رازی بین بە وشە یۆنانیەکەو هاوواتا ئینگلیزیەکەی، پرسیار لە هەر شارەزایەکی مەسیحی دەکەم ئەو ناوە بۆ کێ دەگەڕێتەوە؟ لە وەڵامدا دەبینیت بێگومان و دوودڵی دەڵێت (موعزی روحولقودسە(یووحەننا 14: 26) ئەو رستە تەنها بەشێکە لە دێڕی بیست و شەش، دواتر هەمو دێڕەکە دێنین، بەڵام پێویستە پێشتر بزانین عەقڵیەتی مەسیحی چۆنە بەرامبەر بە ناوی هەڵەی روحولقودس یان بنیۆما کە بنەرەتی ئیغریقی ناوی رۆحە، لە دەستنووسە یۆنانیەکانی عەهدی جەدیددا وشەیەکی جیا نیە بۆ وشەی رۆح، ئێستا مەسیحیەکان شانازی بەوەوە دەکەن کە دووهەزارو چوارسەد دەستنووسیان هەیە کە دوانیان وەك یەك نین.

ئەوانەی نوسخەی مەلیك جیمس یان نوسخەی جێمتمانە یان نوسخەی رۆمانی کاسۆلیکی کتێبی پیرۆزیان نووسیوەتەوە، کاتێك وشەی (بنیۆما) یان

وەرگێڕاوە، گرنگی و پێشینەییان داوە بە وشەی (Ghost) لە بری وشەی (Spirit).

ئەوانەی پێداچوونەوەیان کردووە بۆ نوسخەی جێمتمانە کە نوسخەی نوێی کتێبی پیرۆزە، وەك خۆیان دەڵێن گەڕاونەتەوە بۆ دەستنووسە زۆر کۆنەکان، ئەو کەسانە وا وەصف کراون کە سی و دوو زانای پایەبەرزن و سەر بە پەنجا تائیفەی جیاوازن، ئەمانە دلێرانە ئاڵوگۆڕی ئەو دوو وشەی پێشوویان کردووە، ئیتر ئێستا لە هەموو وەرگێڕانە نوێکالندا مەعرزی بە (the Holy Spirit) دەخوێنیتەوە، لەکاتیێدا خاچپەرستە مەسیحیەکان بە سەرسەختی وابەستەی وشە پێشووەکەن ("Gost "– y١) و نوسخە نوێکان وەرناگرن، جا باشتر وایە هەمان نوسخە کۆنەکە وەربگرین (نوسخەی رۆمانی کاسۆلیکی).

هەرچەندە وشەی (spirit) دانراوە، بەڵام دوای وردبینی بەمجۆرە دێڕەکە بەمجۆرە دەیخوێنیتەوە: (بەڵام موعزی رۆحولقودس کە باوك بەناوی منەوە دەینێرێت ئەو هەموو شتێکتان فێر دەکات و چێم پیێ وتووە بۆ ئێوە هەموویتان پیێ دەڵێت) (یوحەننا 14: 26).

بۆ ئەوەی هەست بەوە بکەیت دەستەواژەی رۆحولقودس راستیەکی تەواوە پێویست ناکات زانایەکی زۆر شارەزا بیت بە کتێبی پیرۆز، بەڵکو پێویستە لەنێو کەوانەدا دابینێیت وەك وشە زیادەکانی من لەناو کەوانەدان،

هەرچەندە نووسەرەوانی نوسخەی مەلیك جیمس وشەی (درازن) یان لەو نوسخە دەرکردووە کە گوایە پوختیان کردووەتەوەو جێی شانازییانە، بەڵام ئەو بەشەیان هێشتووەتەوە کە دژی پێشبینیە روونەکانی پێغەمبەر عیسایە سەبارەت بە خودی موعزی.

## (Holy Spirit) پێغەمبەری ئیسلامە

لەوانەیە تێبینی ئەوە بکەیت زانایەکی شارەزا بە کتێبی پیرۆز نەبێت کە دەستبەرداری وشەی (باراکلیتۆس)ی ناو یووحەنناى نوسخەی ئەصلی یۆنانی نەبووبێت لەبری وشەی (Holy Ghost) ئێستا دەتوانین بڵێین موعزی خودی (Holy Ghost) دەکات، واتە پێغەمبەر موحەممەد(ﷺ).

ئێمە وەك موسڵمان بڕوامان وایە هەموو پێغەمبەران مەعصوومن، کاتێك وشەی پێغەمبەری ئازیز لەنێو موسڵماناندا بەکاردێنین لە هەموو جیهاندا موسڵمانان دەزانن پێغەمبەری ئیسلام دەڵێین، بە هەر جۆرێك ئەو دەستەواژانەی ناو کتێبی پیرۆز وەربگرین هەر پێشبینیەکە بۆ پێغەمبەر موحەممەد(ﷺ) گونجاوو و لەبارە بێ ئەوەی وشەکان کێش کەین و دەستکارییان بکەین.

لە خودی یووحەننادا کە وا باوە دەبێت بەرپرسی ئەو ئینجیلە بێت کە بە یووحەننا ناسراوە، سێ نامەی تر نووسراونەتەوە کە ئەوانیش بە بەشێك لە کتێبی پیرۆزی مەسیحی دانراون، سەرت سوڕدەمێنێت کە لەوێ وشەی (Holy Ghost) بۆ پێغەمبەری ئیسلام بەکارهاتووە:

(ئەی خۆشەویستان، بڕوا بە هەموو رووحێك مەکەن، بەڵکو رووحەکان تاقی بکەنەوە، ئایا لە خواوەن؟ چونکە پێغەمبەرانی درۆزن زۆرن کە لە جیهاندا خۆیان نواندووە). (یووحەننا 4: 1)

دەتوانین تێبینی ئەوە بکەین کە وشەی رووح وەك هاوواتایەك بۆ وشەی پێغەمبەر بەکارهاتووە، رووحی حەقی بریتیە لە پێغەمبەری حەق، رووحی درۆزنیش بریتیە لە پێغەمبەری درۆینە، بەڵام بۆ ئەوا مەسیحیانەی ناسراون بە (دووەم لەدایکبوون) و تەنها بە دیدی سۆزداری دەڕوانن، ئامۆژگاریم بۆیان ئەوەیە نوسخەیەکی مەلیك جیمس بگرنەدەست کە لیژنەیەکی زانایان سەرپەرشتی بون و تێبینی و پەراوێزیان بۆ نووسیوە، کاتێك دەگەنە وشەی یەکەمی (spirit) ئاماژە دەدەن بە پێویستی گەڕانەوە بۆ ئینجیلی مەتا 7: 15 کە جەخت لەوە دەکاتەوە پێغەمبەرە درۆیینەکان بریتین لە رووحە درۆزیینەکان، هەروەها بەپێی قەشە یووحەنناش بێت (spirit)ی پیرۆز بریتیە لە پێغەمبەری ئیسلام و موحەممەد (ﷺ) کە پێغەمبەری خوایە.

**تاقیکردنەوەیەکی شەرعی:**

بەڵام قەشە یووحەننا هەروا ڕێ نادات لەخۆوە ڕاست و هەڵە دیاری بکەین، بەڵکو تاقیکردنەوەیەکمان پێدەدات تا پێغەمبەری حەق جیا بکەینەوە: (بەمە رووحوللاه دەناسنەوە: هەر رووحێك دان بنێت بە یەسووعی مەسیحدا کە لە جەستەوە هاتووە ئەوە لە خواوەیە) (یووحەننا 4: 2)

بەپێی وتەکەی یووحەننا وشەی رووح هاوواتای وشەی پێغەمبەرە، هەروەها وشەی رووحوللاه واتە پێغەمبەری خوا، هەموو رووحیێ واتە هەموو پێغەمبەرێ، حەقە بزانن پێغەمبەر(ﷺ) چی فەرمووە سەبارەت بە عیسای مەسیح کە لە قورئاندا زیاد لە بیست و پێنج جار ناوی هاتووە، ئێمە پێغەمبەر عیسا بەرز رادەگرین و ناوی عیسای کوڕی مەریەم و صالح و کەلیمەتوللاهو رووحوللاهو مەسیحی بۆ بەکاردێنین، خوا دەفەرموێت:

﴿ وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يَـٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٤٢﴾ يَـٰمَرْيَمُ ٱقْنُتِى لِرَبِّكِ وَٱسْجُدِى وَٱرْكَعِى مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۚ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَـٰمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٤﴾ إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يَـٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾ آل عمران: ٤٢ – ٤٥

(یادی ئەوە بکە کاتێ کە فریشتە (جیبرییل) وتی : ئەی مەریەم بێگومان خوا تۆی هەڵبژاردو پاکی کردیتەوە (لە هەموو خووڕەوشتێکی ناشیرین) وە ڕێزی داویت بەسەر هەموو ژنانی جیهاندا، ئەی مەریەم فەرمانبەری پەروەردگارت بکە وە سوژدەو کڕنوش بەرە لەگەڵ ئەوانەی کە سوژدەو کڕنوش دەبەن، ئەوی وترا لە هەواڵە پەنهانەکانن بە سرووش بۆت دەنێرین وە تۆ لە لای ئەوان نەبوویت کاتێ کە قەڵەمەکانیان هاوێشت کامیان دەستەبەرێتی مەریەمیان بەردەکەوێت وە تۆ لەلایان نەبوویت کە دەمەقاڵێیان دەکرد (لەم ڕووە)وە، کاتێ کە فریشتەکە وتی: ئەی مەریەم بێگومان خوا مژدەت دەداتێ بە وتەیەك لەوەوە کە ناوی مەسیح(عیسا)ی کوڕی مەریەمە بەڕێزو پایەبەرزە لە هەردوو جیهاندا وە لە نزیکانی بارەگایە).

## موحەممەد (ﷺ) (یەکێکی تر)ە

موعزی لە یووحەننادا ناکرێت رووحولقودس بێت چونکە عیسا پێغەمبەر ئەوەی روون کردووەتەوە:

(من داوا لە باوك دەکەم، ئەویش موعزیەکی ترتان بۆ دەنێرێت تا بۆ هەتا هەتایە لەگەڵتان بمێنێتەوە). (یووحەننا 14: 16)

لێرەدا وشەی (کەعزیەکی تر) واتە جیا لەوەی یەکەم، واتە کەسێکی تر، بەلام لە هەمان چەشن، دیارە لە یەکەم جیایە، دەی کەوابوو موعزی یەکەم کێیە؟

هەموو جیهانی مەسیحی یەکدەنگن کە لەو بارەدا قسەکەر خودی قسەکەرەکەیە، دەی موعزی یەکەم عیسایە، دواتر ئەوی دی دێت، ئەوەی دواتر دێت دەبێت وەك یەکەم وابیت و باری برسێتی و تینیوێتی و خەفەت و مەرگ بیگرێتەوە.

بەلام ئەو بەلێنەی (هەتا هەتایە لەنێوتاندا بمێنێتەوە) مەبەست کەسێك نیە هەتاهەتایە بژی، عیسا پێغەمبەر جەستەیەکی لەناوچوو بوو، دەبێت ئەوەی دواتریش دێت لەناوبچێت، بۆیە هیچ مرۆڤێك نیە هەتاهەتایە بژی.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ﴾ آل عمران: ١٨٥

(هەموو نەفسێ تامی مەرگ دەکات).

بە مانەوەی ڕێنماییەکانی زیندووە:

ڕۆح نامرێت، بەڵکو کە لە کاتی مەرگیدا لە جەستە جیا دەبێتەوە ڕۆح تامی مەرگ دەچێژێت، بەڵام پەیامەکەیەتی کە هەمیشە دەمێنێتەوە لەگەڵماندا، مووسا ئەمڕۆ بە ڕێنماییەکانی لەگەڵماندایە، عیسا ئەمڕۆ بە ڕێنماییەکانی لەگەڵماندایە، ئەمە هوڵێکی نوێ نیە بۆ بیانووهێنانەوەو نەیاری عەقڵ بێت، بەڵکو ئەمە لەسەر وتەو پەیامی خودی عیسای مەسیح دەڵێت.

لە ئیصحاحی بیست و شەشدا عیسای مەسیح باسی چیرۆکی (پیاوی دەوڵەمەند و پیاوی هەژار) مان بۆ دەکات، کاتێك هەردووکیان دەمرن لە سەرەنجامێکی جیاوازدان، یەکێك لە بەهەشت و ئەویان لە دۆزەخدا، دەوڵەمەندەکە هێدی هێدی لە دۆزەخدا دەکوڵێت، ئیبراهیمی باوکمان بانگ دەکات تا (لازاروس)ی بۆ بنێرن تا تینوێتی بکوژێنێتەوە، بەڵام کاتێك هەموو هەوڵ و دڵبۆسووتانەکان بێ ئاکام دەبن، وەك کۆتا داواکاری داوا لە ئیبراهیمی باوکمان دەکات جارێکی تر (لازاروس) بنێرێت بۆ سەر زەوی برا زیندووەکانی ئاگادار بکاتەوە لەو ماڵوێرانی و لەناوچوونە نزیکەی کە ئەگەر وریا نەبن لە ڕێنمایی و هۆشیاریەکانی خوا ڕوودەدات-بۆیان-، بەڵام ئیبراهیم دەڵێت ئەگەر ئەوانە-کە هێشتا لە سەر زەویدا زیندوون- گوێ لە مووساو پێغەمبەران نەگرن، ئەگەر مردوویەکیش هەستێتەوە بڕوا ناکەن). (لۆقا 16: 31)

عیسای مەسیح دوای چەند سەدە لە مەرگی پێغەمبەرانی ئیسرائیل وەك ئیرسیا و هووسیا و زیتشاریا و ..هتد ئەو راستیەی باسکردووە.

دوای سیانزە سەدە لە وەفاتی مووسا پێغەمبەر عیسا لە سەردەمی فریسیەکاندا هات، ئێمە هێشتا دەتوانین گوێ بگرین لە مووسا و پێغەمبەرانی تریش، چونکە ئەوان هێشتا زیندوون و بە رێنماییەکانیان لەگەڵماندا دەژین.

لە هەمان سەردەم:

ئەگەر بوترێت موعزی بەڵێنی داوە بە شوێنکەوتواتی مەسیح نەك بە خەڵکێ دوای شەش سەد ساڵ (–خوا– موعزیەکی ترتان پێ دەبەخشێت تا هەتا هەتایە لەگەڵتان بمێنێتەوە). (یووحەننا 14: 16)

جێی سەرسوڕمانە کەسی مەسیحی زۆر گەرموگوڕە لە ئاست بیانووهێنانەوە بۆ رووداتی ئەو پێشبینیانە کە هەر لە سەرەتای جیهانەوە هاتون تا دەگاتە دوو هەزار ساڵ لە ئامۆژگاریەکەی بوتروسی دووەم بۆ جوولەکە کە بێداریان دەکاتەوە: (چونکە مووسا بە ئەبەکانی وت خوا دواتر پێغەمبەرەکەتان بۆ بەرز دەکاتەوە لەنێو براکانتاندا وەك من وایە، دەی گوێی بۆ بگرن لە هەموو شتێکدا کە پێتان دەڵێت) (سیفری کاری پێغەمبەران 3: 22).

هەموو ئەم راناوانە کە دەگەڕێنەوە بۆ (ئێوە) لە بنەڕەتدا لە سیفری (تثنية الإشتراع: 18) هاتون کاتێك مووسا گەلەکەی دەدوێنێت و ئەوان لەو سەردەمەی پوترۆسدا جوولەکە نین دوای سیانزە سەدە، نووسەرانی ئینجیل وشەکانیان لە دەمی مەسیح وەرگرت، بانگەشەی ئەوە دەکەن بۆ ماوەی دوو هەزار ساڵ پێشبینیەکان هاتوونەتە دی، من پێم وایە یەك نموونە بەسە بۆ روونکردنەوە:

(کەی دەریانکردن لەم شارە راکەن بۆ یەکێکی تر، چونکە من(عیسا) تەنها حەقتان پێ دەڵێم، شارەکانی ئیسرائیل تەواو ناکەن تا کوڕی مرۆڤ دێت(عیسا) ). (مەتا 10: 23)

چاودێری هەورەکان دەکات.

ئەو شوێنکەوتە یەکەمینانەی مەسیح هەمیشە لە راکردندا بوون و بێهیواو چەوساوە لە دەربەدەریدا بوون، لە شارێکیەوە بۆ شارێکی تری ئیسرائیل دەچوون و چاویان لەسەر هەر هەورێ بوو و چاوەڕوانی هاتنی عیسا بوون تا بۆ جاری دووەم بێتەوە، موژدەبەرانیش هیچ گومانیان نەبوو لە هەزار پێشبینی بەدینەهاتوویان، خوای گەورە نەیکردنە پێناوی چاوەڕوانی

هاتنی باراکلیتۆس-موعزی- یان ئەحمەد، بریا بە رازیبوونیان بە کۆتای پێغەمبەران موحەممەد(ﷺ) عیرفان و گەورەییان بنواندایە.

## مەرجەکانی هاتنی موعزی:

بە دڵنیاییەوە موعزی بریتی نیە لە رووحولقودس، چونکە هاتنی موعزی مەرج بووە، لەکاتێکدا رووحولقودس مەرجدار نەبووە، وەك لە پێشبینیەکاندا تێبینی دەکەین:

(بەڵام من حەقتان پێ دەڵێم، چاکترە بۆتان من بڕۆم، چونکە ئەگەر من نەڕۆم موعزی نایەت بۆ لاتان، بەڵام ئەگەر من رۆیشتم ئەوە دەینێرم بۆتان). (یووحەننا 16: 7)

(ئەگەر من نەچم، ئەوە هەرگیز نایەت، بەلام کە من چووم ئەوا دواتر دەینێرم بۆتان).

ئەمە چەند نموونەی جیاجیان لە کتێبی پیرۆزدا سەبارەت بە هاتنی رۆحی پیرۆز پێش لەدایکبوون و دوای جێهێشتنی مەسیح، ئایا هاوڕای ئەمەیت؟ دەی بێزەحمەت بۆ دڵنیایی دەقەکان بگەڕێرەوە سەر کتێبی پیرۆز:

پێش لەدایکبوونی مەسیح

(...لە سکی دایکیدا (یووحەننای موعەمدان) پڕ دەبێت لە ڕووحولقودس). (لۆقا 1: 15)

(ئەلیسابات سکپڕ بوو لە ڕوحولقودس). (لۆقا 1: 67)

(زەکەریای باوکی پڕ بوو لە ڕوحولقودس). (لۆقا 1: 67)

دوای لەدایکبوونی مەسیح

(ڕووحولقودس لەسەری بوو–سەمعانلی قدیس) (لۆقا 2: 26)

( –عیسا– ڕووحولقودس لە شێوەیەکی جەستەیی وەك کۆتر دابەزیە سەری) (لۆقا 3: 22)

جا لەم بەڵگانەی سەرەوە کە پێش و پاش هاتنی عیسا پێغەمبەرن، کەس ناتوانێت هەر وا سەرسام بێت بە قەشە لۆقا کە بە تایبەتمەندی ڕووحولقودس دەردەکەوێت، لەوانەیە بپرسین لە مەسیحیەکان پاش دابەزینی کۆترەکە، عیسا بە یارمەتی کێ ئەو هەموو موعجیزەی بەدیهێنا ئەگەر بە یارمەتی ڕووحولقودس نەبووە؟

ڕێ بەن مامۆستا خۆی پێمان بڵێت کاتێك لەلایەن جوولەکەوە تۆمەتبار کراوە کە لەگەڵ ئیبلیسدا هاوپەیمانی بەستووە بۆ ئەنجامدانی موعجیزەکان، عیسا پرسیاری کرد لێیان: شۆن شەیتانێ دەتوانێت شەیتانێ دەربکات؟ جوولەکەش ئەوەیان بە ڕۆحی پیرۆز و ڕۆحی خوا وەسف کرد کە هاوکاری بووە بۆ شەیتانی بوونی، ئەمەش خیانەتێکی گەورە بوو بۆ پایەی باڵا، بۆیە ئاگادارکردنەوەیەکی ترسناکی پێدان:

(..ئەو قسەوتنەو ناشوکریە بەرامبەر رووحولقودس ئەوە هەرگیز لێتان خۆش نابێت) (مەتا 12: 31).

ئەو رووحولقودسە ئەوە نیە کە خودی مەتا لە سێ ئایەتی پێشوودا باسی کردووە، مامۆستا دەڵێت (بەڵام ئەگەر من-عیسا رووحی خوا بم شەیتانەکان دەربکەم ئەوە مەلەکووتی خوا بەرووتاندا دێت) (مەتا 12: 28).

هەمان دەربڕین لەگەڵ دەقەکەی تر بەراورد بکە:

(ئەگەر من –عیسا– پەنجەی خوا بم شەیتانەکان دەربکەم ئەوە مەلەکوتی خوا بەرووتاندا دێت) (لۆقا 11: 20).

پێویست ناکات شارەزای وردی کتێبی پیرۆز بیت بۆ تێگەیشتن لەوەی دەستەواژەکانی پەنجەی خوا و ڕۆحی خوا و رووحولقودس هاوواتان،

هەربەوچەشنە رووحولقودس یارمەتی عیسای داوە بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکەکەی، هەروەها رووحولقودس یارمەتی خوێندکارەکانی داوە تا ئەرکی بانگەوازو چارەسەیان بەجێبگەیەنن، ئەگەر هێشتا بچووکترین گومانتان هەیە سەبارەت بە کاری رووحولقودس ئەوە بخوێننەوە:

بەڵێنی پووچ:

(وەك باوك منی نارد من دەتاننێرم–خوێندکارەکانی عیسا–، کاتێك وتی ئەوە نەفخەو بەوانی وت: رووحولقودس قبووڵ بکەن) (یووحەننا 20: 21–22).

بە دڵنیاییەوە ئەمە بەڵێنێکی پووچ نەبووە، دەبێت شوێنکەوتوان بچن بەدەم ئەو دیاریەی رووحولقودسەوە، بەهەمانشێوە ئەگەر رووحولقودس لەگەڵ یووحەننای موعەمدان و ئەلیسابێت و شوێنکەوتوانی عیسا بێت، ئەوە قسەیەکی بێمانایە:(ئەگەر من نەچم ئەوە هەرگیز مەسیح نایەت بۆتان)، بۆیە موعزی رووحولقودس نیە.

رستەی بابەتی تێژینەوەکە کە لە یوحەننا 16: 7 دا هاتووە زۆر دڵخۆشی کردم کە توانیم بە زمانی عەرەبی و لە خاکی فیرعەونەکاندا لەبەردەم خاتوونێکی مەسیحی قیبتیدا بەکاری بهێنم، چ خۆشبەختیەکە

کاتێك دێڕێکی کتێبی پیرۆز بە زمانی رەسەنی ناوچەکە دەخەیتەڕوو، من بۆ سوانزە زمانی گشتی جیاواز ئەمەم درووە، بەڵکو تۆیش ئەو دێڕەی پێشوو بە زمانێ یان دوو زمان بزانیت تا لەبەرژەوەندی ئیسلام بەکاری بهێنیت.

## بڕی خوێندکاری خراپ:

ئێستا زیاد لە چوار دێڕی تەواو و یەکلاکەرەوەی ناو یوحەننا دێنین، ئیصحاحی شانزە تا دەستەواژەی جێگرەوەی یەسووع باس بکەین، عیسا دەڵێت:

(چەندین باسوخواسم هەیە کە پێتان بڵێم، بەڵام ئێستا ناتوانن بەرگەی بگرن). (یووحەننا 16: 12)

دواتر دەستەواژەی (چەندین باسوخواس) لە رستەی سەرەوە لەگەڵ (هەموو حەق) لە رستەی خوارەوە پێکەوە دەبەستینەوە، ئێستا رێ بدەن قسە بکەین لەسەر دەستەواژەی (ئێستا ناتوانن بەرگەی بگرن)، لە راستیدا ئەم دەستەواژەیە لە چەندین لاپەرەی عەهدی جەدیدا دووبارە بووەتەوە:

–عیسا– وتی پێیان–بەخوێندکارەکانی– بۆچی دەترسن ئەی ئیمان لاوازان؟ (مەتا 8: 26).

-عیسا- وتی پێی -بە پوتروس- ئەی ئیمان لاواز... (مەتا 14: 31).

-عیسا- وتی پێیان -بە خوێندکارەکانی- بۆچی بیر لە خۆتان دەکەنەوە ئەی ئیمان لاوازان... (مەتا 16: 8).

دواتر وتی-عیسا- پێیان- بەخوێندکارەکانی- ئیمانەکەتان لەکوێیە؟ (لۆقا 8: 25).

دەبێت بزانین ئەمە تۆمەتێك نیە عیسا دابێتیە پاڵ جوولەکە هەڵگەڕاوەکان، بەڵکو بۆ دەستەی هەڵبژاردەی تایبەتە، ئەوەتا دابەزیوەتە ئاستی منداڵە بچووکەکان تا مەسەلەکان بۆ خوێندکارەکانی روون بکاتەوە، بەڵام ئەوان ناچاریان کرد بەوەی هەست بە داکەوتن بکات:

یەسووع وتی ئایا تا ئێستاش ئێوەش تێنەگەیشتون؟ (مەتا 15: 16).

کاتێك تەواو تووڕە کرا، لەو هەڵبژاردنەی تووڕە بوو و وتی:

(ئەی نەوەی ناباوەڕدار و بێباك تا کەی لەگەڵتان بم و بەرگەتان بگرم؟) (لۆقا 9: 41)

خێزانەکەی بڕوایان وابوو شێتە:

ئەگەر عیسا لەبری ئەوەی جوولەکە بێت یابانی بوایە ئەوە بەختەوەر بوو کە بەو خۆبەختکردنە ئەوانی رزگار کردووە، بەڵام بە داخەوە زۆربەی پێغەمبەران بەختیان نەبووەو خێزانەکانیان بڕوایان پێ نەهێناون، (براکانی- عیسا- بڕوایان پێ نەهێنا) (یوحەننا 7: 5)، لەراستیدا هێندە لایاندا تا ئەوەی ویستیان بیگرن، چونکە بڕوایان وابوو شێتە:

(کاتێك نزیکەکانی بیستیان چوون تا بیگرن چونکە وتیان ئەو -عیسا- تێکچووە) (مرقس 3: 21).

جا ئەو خزمو هاوڕێیانە کێ بوون کە دوودڵ بوون لە سەلامەتی عەقڵی عیسا؟ رێ بدەن قەشە جی ئار دۆمیللۆ کە ماجستێری هەیە لە زانستی کتێبی پیرۆزدا ئەوەمان بۆ باس بکات:

(ئەوکات براکانی و دایکی هاتن...خێزانەکەی وتیان ئەو دژی خۆیشیەتی) (واتە لە رووی عەقڵیەوە شێواوە) نوسساخەکان-زاناکانی جوولەکە- وتیان (شەیتان دەستی لێ وەشاندووە)، بەڵام ئەوە نەبووە بەڵکو رای راستتر ئەوەیە خێزانەکەی لەگەڵ زاناکانی جوولەکەدا هاوسۆز بوون)، (ئەوان گومانیان هەبوو لە سەلامەتی عەقڵی‌و دەیانویست دەستبگرن بەسەریدا).

عیسا له‌لایه‌ن ئوممه‌ته‌که‌یه‌وه‌ قبووڵ ناکرێت:

ئه‌مه‌ بڕیاری که‌سه‌ نزیکه‌کانی عیسا بوون، جا وه‌ڵامی ئوممه‌ته‌که‌ی –جووله‌که‌– چی بووبێت، دوای هه‌موو ئه‌و بانگه‌وازه‌ جوان و کرداره‌ پڕ موعجیزانه‌ی وا خوێندکاره‌که‌ی ده‌ڵێت: (بۆ ده‌سته‌ی تایبه‌تی –جووله‌که‌– هات که‌چی ئه‌وانیش قبووڵیان نه‌کرد) (یووحه‌ننا 1: 11).

راستیه‌که‌ی ئه‌وه‌یه‌ ده‌ده‌سته‌ی تایبه‌تی–جووله‌که‌– گاڵته‌یان پێ ده‌کرد و به‌ که‌م ته‌ماشایان ده‌کرد و به‌ سه‌ختی به‌ره‌په‌رچیان دایه‌وه‌ تا ئه‌وه‌ی هه‌وڵیان دا له‌خاچی بده‌ن، وێڕای ئه‌وه‌ی دووو هه‌زار ساڵ تێپه‌ڕ بووه‌ به‌سه‌ر سه‌ربڕینیدا و چۆن به‌ده‌ستی مه‌سیحیه‌کان ده‌چه‌وسێنرایه‌وه‌، ئێستا ده‌بینین زۆر خۆشیان ده‌وێت وه‌ك ئه‌وه‌ی تیماری ویژدانیان بکه‌ن، جوووله‌که‌ وه‌ك گه‌لێك هه‌رگیز عیسا وه‌ك رزگارێك و نێردراوێکی لای په‌روه‌ردگاریان قبووڵ ناکه‌ن، ئه‌وان زۆر ساکار و یه‌کده‌نگ بڕیاری خۆیان داوه‌: (هه‌رگیز جووله‌که‌یه‌ك ناتوانێت جووله‌که‌یه‌کی تر وه‌ك خوا قبووڵ بکات).

ته‌نها له‌ ئیسلامدا مه‌سیحی و جووله‌که‌و موسڵمانه‌کان ده‌توانن خاڵی به‌یه‌کگه‌یشتن بدۆزنه‌وه‌، چونکه‌ هه‌موان بڕوایان هه‌یه‌ به‌ عیسای مه‌سیح و به‌ یه‌کێك له‌ پێغه‌مبه‌رانی ئولولعه‌زم ته‌ماشای ده‌که‌ن نه‌ك وه‌ك خوا یان کوڕی خوا.

کۆچی خوێندکارەکانی:

ئەی پەرچەکرداری دوانزە هەڵبژێردراوەکەی ناو نزیکانی –دایکی و براکانی– چی بوو وەك ئەوەی کتێبی پیرۆز ناوی بردون، با پرۆفیسۆر بە وتە ناوازەکانی ئەمەمان بۆ باس بکات:

خوێندکارە راستەوخۆکانی هەمیشە خراپ لێی تێدەگەیشتن و داوایان لیٚ دەکرد لە ئاسمانەوە ئاگرێك بێت، داوایان لێدەکرد دەست بگرێت بەسەر مەملەکەتەکەیدا، داوایان لێدەکرد باوك–خوا– یان نیشان بدان تا بە چاوی مرۆیی خۆیان خوا ببینن، چەندین شتیان لیٚ داوا دەکرد، داوایان لیٚ دەکرد هەر شتیٚ بکات، هەموو شتەکانیش پێچەوانەی ئامانجە باڵاکانی ئەو بوون، تا کۆتایی ئەوە هەڵسوکەوتیان بوو لەگەڵی، کاتێك هات هەموو جێیان هێشت و رایانکرد).[1]

لە بەدبەختی عیسای مەسیح بژاردەیەکی حەقیقی لا نەبوو بۆ تاقیکردنەوەی خوێندکارەکانی، بەجۆرێك پشتیان لیٚ کرد کە پێشتر وا پشت نەکرابووە هیچ پێغەمبەریٚ، ئیتر تاوانی مامۆستای تێدا نەبوو، بۆیە راستیەکە دەڵێت: (رۆح حەقیقەتێکی خوازیارە، بەڵام گۆشت–قوڕ– لاوازە) (مەتا 26: 41).

---

[1] - سعيد أمير علي: روح القدس ، ص 31.

لەراستیدا قورِ ناکرێت مرۆڤێکی نویێ بێت، بۆیە بەرپرسیاریەتەکە دەگوازێتەوە بۆ ئەو جێگرەوەی کە لێرەدا بە روحولحەق واتە پێغەمبەری حەق، پێغەمبەری دادپەروەری ناوی دەبات، چونکە وشەی رووح و پێغەمبەر هاوواتای یەکن، (هەرکات ئەو روحولحەققە هات رێنموونیتان دەکات بۆ هەموو حەقێك) (یووحەننا 16: 13).

لە کتێبی پیرۆزدا وشەی رووح هاوواتای پێغەمبەرە، بۆیە پێغەمبەری حەق ئەو پێغەمبەرە راستیەیە کە لە شێوەی مرۆڤدایەو لە ماوەی ژیانیدا هەوڵ و گەورەییەکی زۆری نواند و تەنانەت لەنێو ئەو هۆزە بتپەرستەی خۆیدا کە پێیان دەوت راستگۆی سپاردەکار کاری بۆ خۆی نەدەکرد، بەراستی پێغەمبەر(ﷺ) دڵسۆزیێ بوو کە لە بەڵێنی خۆی لاینەدەدا، ژیان و کەسێتیەکەی بەڵگەیەك تەواوە لەسەر ئەوەی حەقی نواندووە.

## باسی چوارەم: سەرکردایەتی گشتگیر

زۆر و هەموو:

وەك پێشتریش بەڵێنمان دابوو دواتر ئەم دەقە(چەندین باسوخواسم هەیە تا پێتان بڵێم) لەگەڵ دەقی (ئەو رێنموونیتان دەکات بۆ هەموو حەقێك) (یووحەننا 16: 12 و 13)، ئەگەر مەسیحیەك هێشتا پێی وابێت رووحولحەق لەو پێشبینیەدا بریتیە لە روحولقودس، من لێی دەپرسم ئایا وشەی زۆر لە زمانەکەیدا هەیە کە واتای زیاتر لە یەك دەگەیەنێت؟ هەروەها (هەموو) یش واتای زیاتر لە یەك دەگەیەنێت؟ ئەگەر وەلامەکە بەڵێ بوو بەلام بە رارایی و دوودڵیەوە، ئەوکات کتێبی پیرۆز دابخە؛ چونکە ئەوە حەقیقەت نیەو گفتگۆیەکی گەمژانەی بەدوادا دێت، بەلام ئەگەر گورجوگۆڵ وەلامی بەڵێ بوو ئەوکات درێژەی پێ دەدەین.

پێشبینیەکەی عیسا (چەندین باسوخواس) باس نەکراوە، وێڕای رێنموونی مرۆڤایەتی بۆ هەموو حەقێك، لەمڕۆدا چەندین کێشە هەن تووشی مرۆڤ دەبن و وەلاممان دەست دەکەوێت بۆیان، دەی ئەرك نەبێت تۆ شتێکت لایە کە لە ماوەی دوو هەزار ساڵی پێشوودا روحولقودسی بانگەشە بۆکراو دابێتی بە هیچ کەسێك؟ پێچەوانەی ئەو هەموو قسە جیاوازەی کە عیسا فەرموویەتی؟ زۆرم ناوێت، تەنها یەك نموونەم دەوێت.

بڕوا بکە، ماوەی چل ساڵە قرسیارێکم هەیەو هێشتا وەڵامێکی مەسیحیم دەست نەکەوت بۆ یەك (حەقیقەتی نویێ) کە رووحولقودس هێنابێتی، هێشتا بەڵێنی هاتنی موعزی (بۆ هەموو حەقێك) ماوە، ئەگەر روحولحەق لەو پێشبینیەدا بریتی بێت لە روحولقودس و هەر کلێسا و دەستەیەك بانگەشەی (لەدایکبوویەکی نویێ) بۆ مەسیحیەکان دەکەن، وەك چۆن رۆمانە کاسۆلیکیەکان هەمان بانگەشە دەکەن، میسۆدی و شەهیدانی رەب و سەبتەکانی رۆژی حەوتەمو تەعمیدیەکان و مەسیحیە دیلفانیەکان و چەندینی تر بانگەشەش لەدایکبوونی نویێ دەکەن، ژمارەی ئەوانەی ئەو بانگەشە دەکەن تەنها لە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا ژمارەیان لە سەروو حەفتا ملیۆن کەسە، مافی خۆتە داوای چەند چارەسەرێك بکەیت شیاو بە روحولقودس سەبارەت بە چەند کێشەیەکی وەك: مەی و قومار و فاڵچیەتیو بتپەرستی و شەیتان پەرستی و رەگەزپەرستی و فرەژنی و ...هتد.

## کێشەی مەی

له کۆماری باشووری ئەفریقی و به کەمینەیەکی (سپی پێست) که ژمارەیان چوار ملیۆن کەسە لەنێو دانیشتوانێکی سی ملیۆن کەسیدا زیاد له سێ سەد هەزار کحول دەخۆنەوە، له زامبیای دراوسێ به (سکیرین) ناسراون.

دەوترێت ژمارەی رەنگاورەنگەکان(تێکەڵەی رەش پێست وسپی پێستەکان) له باشووری ئەفریقی پێنج هێندەی هەر رەچەڵەکێکی تره لەئاست مەینۆشان یان له ئاست هیندیە ئەفریقیەکان، هەرچەندە سەرژمێری تایبەت به مەینۆشان بەردەست نیە.

جیمی سواجارتی نووسەر له گۆڤاری (تلیفانجلیست) له کتێبەکەیدا (مەی) باس لەوە دەکات له ویلایەتە یەکگرتووەکان پانزە ملیۆن کەس کحوول دەخۆنەوەو چلو چوار کەس به زۆری مەی دەخۆنەوە، بۆ ئەو وەك موسڵمانێ جیاوازی ناکات لەنێوان کحول و مەیدا هەموویان به سەرخۆش دادەنێت.

تاوانی مەینۆشی لەئاست جیهاندا بڵاوە، روحولقودس تایبەت بەو تاوانە له رێی هیچ کڵێسایەکەوە هیچ قسەیەکی نیە، جیهانی مەسیحی خۆی بێئاگا کردووە له کێشەی مەینۆشی و سێ بنەرەتی له کتێبی پیرۆزەوە بۆ هێشتووەتەوە:

یه‌که‌م: (خواردنه‌وه‌ی به‌هێز(مه‌ی سه‌ختی بۆنخۆش) بده به‌وه‌ی ده‌مرێت (له سه‌ره‌مه‌رگدایه)، شه‌ربه‌ت بده به‌وانه‌ی دڵیان نه‌خۆشه، ڕێ بده بخواته‌وه‌و هه‌ژاری خۆی له‌بیر بچێته‌وه‌و جارێکی تر بێهیوایی خۆی بیر نه‌یه‌ته‌وه). (الّمپال 31: 6–7)

ئه‌مه فه‌لسه‌فه‌یه‌کی نوێیه بۆ مانه‌وه‌ی حه‌زی گه‌لان بۆ کۆیلایه‌تی، واده‌زانم تۆش هاوڕای منیت.

یه‌که‌م موعجیزه‌ی کرداری:

دووه‌م: عیسا له‌ناویه‌ری خۆشی و به‌خته‌وه‌ری نه‌بووه، وته‌ی بۆ ئه‌وه‌ی ده‌خواته‌وه ئه‌وه بووه له یه‌که‌م موعجیزه‌ی تۆمارکراوی له کتێبی پیرۆزدا وتوویه‌تی ئاوی گۆڕیوه بۆ (نه‌بیژ):

(عیسا پێی وتن: قاپ بڕ بکه‌ن له ئاو، تا لێواری پڕیان کرد، ئه‌ویش پێی وتن ئێستا ده‌ریبکه‌ن... کاتێك حاکمی جه‌ژن ئاوه‌که‌ی خوارده‌وه بینی (نه‌بیژه)... وتی...(بۆچی) تا ئێستا (نه‌بیژ) ی وا چاکتان هێشتووه‌ته‌وه) (یووحه‌ننا 2: 7–10) له‌م موعجیزه بانگه‌شه بۆ کراوه‌وه (نه‌بیژ) له جیهانی مه‌سیحیدا وه‌ك ئاو وایه.

سێیەم: پۆلسی پیرۆزی خوێ،دکاری سیانزەهەمی یەسووعی مەسیح و دامەزرێنەری راستەقینەی مەسیحیەت ئامۆژگاری تیمۆساوس دەکات کە هاتووەتە ناو ئاییینی نوێ و لە باوکێکی یۆنانی و دایکێکی مەسیحی لەدایکبووە:

(تەنها ئاو بخۆرەوە، بەڵام کەمێك (نەبیژ) بەکاربهێنە بۆ پێویستی گەدەو نەخۆشیەکانت) (تیمۆسی 5: 23)

مەسیحیەکان هەموو بەڵگەکانی کتێبی پیرۆز سەبارەت بە خواردنەوەی چالاکبەخش و سەرخۆشکەر وەك قسەی خوا قبووڵ دەکەن و بڕوایان وایە روحولقودس سروشی ناردووە تا ئەم ئامۆژگاریە مەترسیدارانە بنووسرێنەوە، قەشە دۆمیللۆ سەبارەت بەم رستەیە ئازاری ویژدانی گرتوویەتیو دەڵێت: (ئەمە فێرمان دەکات ئەگەر جەستەی مرۆڤ خواردنەوەی چالاکبەخشی پێویست بوو ئەوە مافت هەیە بە دادپەروەری و بێ زێدەڕۆیی لێی بخۆیتەوە).

زیدەڕۆیی نەکردن تاکە وەڵامە:

هەزاران قەشەی مەسیحی هەن کە مەی دەخۆنەوە بەتایبەت لەکاتی ڕێورەسمی نێوارەخوانی پیرۆزی ناو کڵێساکان، ئیسلام تاکە ئایینی سەر زەویە کە هەموو ماددەو خواردنەوە سەرخۆشکەرەکان حەرام دەکات، پێغەمبەری ئێمە دەفەرموێت(ئەوەی زۆرەکەی کەسێك سەرخۆش بکات کەمەکەشی حەرامە)، لە ئیسلامدا هیچ بیانوویەك نیە بۆ کەم‌و زیادی مەی، کتێبی حەق کە یەکێکە لەناوەکانی قورئانی پیرۆز زۆر بە توندی مەی خواردنەوەو قومار و فاڵچێتی و بتپەرستی قەدەغە دەکات، هەر بە یەکجار دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾ المائدة: ٩٠

(ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بێگومان ئارەق و قومار و ئەو بەردانەی کە کراون بە بت و ئەو پارچە دارانەی( کە بەکارئەهێنرێن بۆ دیاری کردنی بەش و چارەنووس) ئەوانە پیسن و لە کردەوەی شەیتانن کەواتە دوور کەونەوە لێی تا ڕزگاربن.)

کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی بەرمیلە مەیەکانی ناو مەدینە جۆگەلەی کووچەیان دروست کردو جارێکی تر پڕ نەکرانەوە، تەنها ئەم ڕێنماییە ئەم ئوممەتە گەورەی موسڵمانانی وا لێکرد ئیتر هەرگیز مەی بەکارنەهێنن.

## ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕێگری پێ نەکرا:

پرسیارەکە لەمەدایە: چۆن پێغەمبەر(ﷺ) توانی بە یەك ئایەت سەرکەوتوو بێت لە بەرگرتن بە مەینۆشی، کەچی ئەمریکایەکی گەورە بەو هەموو عەقڵ و هێزە داراییە حکووم و بانگەشە و ڕاگەیاندنە گەورەوە نەیتوانی لە ڕێی قانوونیەوە مەی قەدەغە بکات؟!

کێ گەلی ئەمریکی ناچار کرد هەوڵ بدەن مەی قەدەغە بکەن؟ عەرەبەکان بوون هەڕەشەیان کرد ئەگەر ئەمریکا مەی قەدەغە نەکات ئیتر نەوتتان نادەینێ؟ نا لە بیستەکانی سەدەی پێشوودا هیچ شتێ نەبوو وەك نەوت پێناوێکی سیاسی دەستی عەرەب بێت تا هەڕەشە بکەن لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، نا، بەڵکو ڕابوونێکی عەقڵی لە نێو ئەمریکیەکاندا پەیدا بوو، ئەمیش لەسەر بنەمای چەند توێژینەوەو سەرژمێریەك کە گەیاندنیە ئەوەی پێویستە مەی قەدەغە بکرێت، کەچی هەرچەندە زۆرینەی خەڵکی وڵات مەسیحی بوون و لە ئەنجومەنی کۆنگرێسدا بوون بەڵام نەیانتوانی سەرکەوتوو

بن، بۆیە ئەوەی سەرچاوەکەی تەنها عەقڵ بێت وەك ئەوە نیە کە سەرچاوەکەی دڵو رۆحی مرۆڤ بێت، چونکە کاتێك ئایەتێکی قورئان دەخوێنیتەوە کە رێ دەگرێت لە مەی، هێزی گۆڕانت بۆ پەیدا دەبێت، با رێ بدەین سۆمان کارلایل سەرچاوەی ئەو هێزە بخاتەڕوو:

## رۆحانیەتی جیهانی –سەرچاوەی هێز:

هەموو بیروباوەرە ناوازەو وتەو دەستەواژەکان وێڕای بنیادی هونەری وەك ئاوازی ئەرمونیان یان مۆسیقای هێدی وان، ئەم جۆرەی رۆحانیەتی بالآ تەنها لەو روانگەوە دێت کە عیسا باسی کردووە(رۆژوو و نوێژ) (مەتا 17: 21).

بەپێی بانگەوازەکەی پێغەمبەر موحەممەد(ﷺ) پاش وەفاتی، یەکێك لە هاوسەرە بەڕێزەکانی کە عائیشەی راستگۆیە پرسیاری لێکرا سەبارەت بە ژیانی موحەممەدی هاوسەری، ئەویش وتی(ئاکاری قورئان بوو) (قورئانێك بوو دەچوو بەرێدا، قورئانێ بوو قسەی دەکرد، قورئانێ بوو دەژیا).

پاڵەوانی رەخنەگر:

ئەگەر بوترێت ئەو قسانە هی کەسانێکن کە بڕوایان هەبووە بە موحەممەد(ﷺ) و دڵسۆزییان نواندووە بۆ خۆشەویستەکەیان، دەی رێ بدەن تا گوێ بگرین لە وتەی رەخنەگرێکی مەسیحی:

(پیاوێکی هەژار بە وردی و بێ پاڵپشتێ هەوڵی دەدا، خەمی ئەو خەمی خەڵکی گشتی نەبوو، ئاکاری بەرز بوو، بەرگەی برسێتی وو هەژاری دەگرت، دوای بیستو سێ ساڵ ئەو عەرەبە جەنگاوەرە خێڵەکی و پەرتەوازانەی گۆڕی، ئەو لێیان نزیك بوو و ئەوانیش زۆر رێزیان دەگرت).

(...ناویان ناوە پێغەمبەر، ئێمەش دەپرسین بۆچی رووبەروو لەگەڵیان رادەوەستاو بە روونی و بە بەرچاوی هەموانەوە عەباکەی بەرز دەکردەوەو نەعلەکانی لە پێ بوو و جەنگی دەکرد و راوێژی دەکرد پێیان، لەنێویاندا بوو و فەرمانی دەکرد، بێگومان دەبێت ئەوان بینیویانە چی پیاوێکە، دەی رێ بدەن کام نازناوەیان پێ خۆشە وا بانگی بکەن، هیچ ئیمپراتۆرێ نەبووە وەك ئەو کابرا جل ئاساییە گوێی لێگیرابێت، ئەمەش لە ماوەی بیست و سێ ساڵ ئەزموونی حەقیقی سەختدا، بەراستی وەك پاڵەوانێکی حەقیقی بەگوێرەتین بۆ بانگەوازەکەی دەیبینم). (توماس کارلایل: بگل و بگل مبجل، ص 93)

کێشەی رەگەزپەرستی(دەمارگیری):

(ئەو-روحولحەق- رێنموونیتان ددەکات بۆ هەموو حەقێك-راستیەك-) (یووحەننا 16: 13).

ئاساییە بۆ شوێنکەوتوانی هەر ئایینێك بای باوکایەتی خوا و برایەتی مرۆڤ بکەن، بەڵام چۆن وەك بیرۆکەیەکی جوان بێتەدی؟ چۆن سیستمێك دابنێین تا مرۆڤەکان لە یەك برایەتیدا کۆبکاتەوە؟ لە ماوەی یەك رۆژدا موسڵمان دەبێت پێنج جار لە مزگەوتی گەڕەکەکەی خۆیاندا ئامادە بێت تا لەرووی رۆحیەوە دەروون بەهێز بێت، رەش‌و سپی و هەژارو دەوڵەمەند و رەگەزی جیاواز و رەنگی جۆراوجۆر هەموو شان لەشانی یەك لە نوێژدا رادەوەستن، لە هەفتەیەکیشدا جارێك کە رۆژی هەینیە واجبە لەسەریان لە مزگەوتداو لە کۆبوونەوەیەکی گەورەتردا کۆببنەوە، ساڵانەش دوو جار لە دوو جەژندا و لە شوێنێکی فراوانتر کە باشتر وایە لە چۆڵەوانی دەرەوەی شار بێت کۆببنەوە، بۆ کۆمەڵگەیەکی فراوانتر و بەلایەنی کەمەوە لە هەموو تەمەندا جارێك لە کەعبەو لە مزگەوتی سەرەککی مەککە بۆ کۆبوونەوەی نێودەوڵەتی کۆببنەوە، لە شوێنێك کە دەتوانیت تورك و ئەسیوبی و چینی و هیندیو ئەمریکی و ئەفریقی پێکەوە ببینیت کە هەموو بە یەك بەرگی نەدووراو یەکسان وەستاون، ئەم یەکسانیە گەورە لە رێورەسمی ئایینی چ بیروباوەڕێکی تردا بەدیدەکەیت؟

چەمکی مەعصوممان هەیە وەك لە قورئاندا هاتووە، تاکە پێوەر لای خوا پشت دەبەستێت بە ئاکارو هەڵسوکەوتی تاك بەرامبەر بە خەڵك، نەك لەبەر رەچەڵەك یان دەوڵەمەندی کەسەکە، ئەمە تاکە راستیەکە کە دەکرێت مەملەکەتی خوای لەسەر دابمەزرێت، ئەمە بەو واتایە نا موسڵمان بێ خەوشەو هیچ نەخۆشیەکی دەمارگیری نیە، بەڵام دەبینیت موسڵمان لە هەر دەستەیەکی تری ئایینی ناو جیهانی ئەمڕۆ دەمارگیری و رەگەزپەرستی کەمترە.

کێشەی فرەژنی:

سروشت وا خۆی دەنوێنێ کە لە جەنگدایە لەگەڵ مرۆڤ و دەیەوێت تۆڵە لە ژێری مرۆڤ بکاتەوە، مرۆڤ گوێ ناگرێت لە چارەسەری تەندروستی و کرداری بۆ کێشەکانیو ملکەچی ئەو بەخششە نیە کە خوا پێی بەخشیوە، بۆیە دەوترێت (هێدی و لەسەرخۆ بە چاڵاوی کوڵاوتدا تێپەڕ بە).

ئەوەی دیارە ڕێژەی لەدایکبوونی کوڕو کچ لە شوێنێکدا تا ئاستێ یەکسانە، بەڵام ڕێژەی مردن لە منداڵی نێرینەدا زۆرترە، چ سەرسوڕمانێکە بۆ رەگەزی لاوازتر؟! هەموو کاتێك ژمارەی بێوەژن لە جیهاندا زیاترە لە ژمارەی بێوەپیاو، هەموو ئوممەتێکی ژیاری زیادەی ئافرەتی هەیە، لە

بەریتانیای گەورەدا چوار ملیۆن ئافرەتی زیادەو لە ئەڵمانیا پێنج ملیۆن و لە رووسیا حەوت ملیۆن و ...هتد.

بەڵام چارەسەری رەوا بۆ کێشەکە لە ویلایەتە یەکرگتووەکانی ئەمریکا وەك چارەسەرێکی رەوا بۆ گەلان لە هەر شوێنێ گونجاوەو جێی قبووڵە، سەرژمێریەکان لە لە زۆربەری گەلانی ژیاریدا زیاتر جێی قبووڵن.

## ئەمریکاو چ ئەمریکایەك:

ئایا دەزانیت لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زیادەی ئافرەت حەوت تا هەشت ملیۆن ئافرەتە؟ ئەمە واتە ئەگەر هەر پیاوێکی ئەمریکی هاوسەرگیری بکات، هێشتا حەوت ملیۆن و هەشت سەد هەزار ئافرەتی بێ هاوسەر دەمێننەوەو کەسیان دەست ناکەوێت تا ببێتە هاوبەشی ژیانیان، تاکە شتێك دەیزانین ئەوەیە لەبەر بوونی چەندین هۆکار هەموو پیاوان هاوسەرگیری ناکەن، بەڵکو پیاوی وا هەیە بیانووی هەیە بۆ ژن نەهێنان، ئافرەت ئەگەر واش بێت هێشتا رێگری هاوسەرگیری نیەو ئەگەر تەنها بۆ پەیداکردنی پەناگەو پاراستنێکیش بێت هاوسەرگیری دەکات، بەڵام کێشەی زیادەی ئافرەت لە ئەمریکا ئاڵۆزە، نەوەدوهەشت لە سەدی بەندیەکان نێرینەن، لە سەروو ئەوەیشەوە بیست و پێنج نێربازیان هەیە، بۆ ئەوەی

ناوێکی هێورتریان لێ بنێن پێیان دەڵێن (جای) کە مەبەست پێی بەختەوەرە، بزانن چ لادانێکیان کردووەو چۆن بەزمەکەیان شێواندووە.

ئەمریکا بە هەر رێگەیەك هەموو شتێك دەکات، ئەوان هەموو شتێکی گەورە بەرهەم دێنن، چ بە گەورەدانانی خوا و چ بە گەورە دانانی شەیتان، جا رێ بدەن لەگەڵ راگەیاندنکاری گەورە-کە ئێستا نەماوە- جیمی سواگارت بێن کە باسی نێربازی دەکات و هاواری بەرز دەبێتەوە:

(ئەمریکا زۆر نابات خوا دادگاییت دەکات-واتە لەناوت دەبات-، ئەبێت سەبارەت بە نێربازی بیانوو بهێنرێتەوە بۆ خوا، لەبەر ئەو پەستیەیان لەناوچوونەکەیان تەواوەتی دەبێت لەبەر ئەو هەموو نێربازیە یان لەبەر خووگرتنیان بە ئارەزووبازی ناڕەوا).

نیویۆرك بە نموونە:

لە نیویۆرکدا یەك ملیۆن ئافرەتی زیادە هەن، ئەگەر هەموو پیاوێك ژنێکی پێ بهێنرێت، هێشتا یەك ملیۆن ئافرەت بێ هاوسەرگیری دەمێننەوە.

بەڵام ئەوەی بارەکەی خراپتر کردووە ئەوەیە ئەو شارە بەوە ناسراوە سێ یەکی ژمارەی نێرینەکانی ئەو شارە نێربازن.

جوولەکە کە لە هەر مشتومڕێکدا زۆر توندو رەقن، کەچی لەوەدا دەڵێێت جرجن هێندە هێورن، ئەمەش لەبەرئەوەی وەك رۆژهەڵاتی دواکەوتە ئەژمار نەکرێن، کڵێساکانیش بە ملیۆنەها کەسەوە کە بانگەشەی ئەوە دەکەن شوێنی حەسناوەی روحولقودسن ئەوانیش بەرامبەر ئەو مەسەلە بێدەنگن.

دامەزرێنەرانی کڵێسای مۆمۆنی کە جۆزیف سمیس و بەریگهام یۆنگن، لە ساڵی 1830ز.دا بانگەشەی سروشێکی نوێیان کرد و بانگەوازی فرەژنی بێسنوور دەکەن تا کێشەی زیادەی ژن چارەسەر بکەن، پێغەمبەرە مۆرۆنیە نوێکان رێنماییەکانی ئەبە کڵێساییەکانی خۆیان پووچەڵ کردەوە تا مۆرکی ئەمریکی سەبارەت بە مەسەلەی فرەژنی رازی بکەن، ئەی ژنە زیادەکانی ناو ئەمریکا و رۆژئاواو ئەورووپا چی بکەن؟ دەبێت بچنە لای سەگەکان.[١]

**تاکە چارەسەر: فرەژنی سنووردارو رێکخراو:**

پێغەمبەری حەق و رۆحی حەق موحەممەد (ﷺ) سروشی خوایی بۆ هێناوین، چارەسەرەی کێشە گەورەکەی ئافرەتانی کردووە:

---

[١] - بڕوانە کتێبەکەی دکتۆر ئەلفرێد کینسی (ژیانی مێینە لە ئەمریکا) و کۆتا نووسینی ماسترز و جۆنسۆن لەو بارەوە.

﴿ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً ﴾ النساء: ٣

(مارە بکەن لەو ئافرەتانەی حەڵاڵن بۆتان دوو دوو یا سیان سیان یا چوار چوار جا ئەگەر ترسان دادگەر نەبن ئەوە یەك ئافرەت)

جیهانی رۆژئاوایی خۆی لە دیدی لێبوردەیی و کراوەییدا نیشان دەدات بەرامبەر ملیۆنەها هاورەگەزباز، مەسەلەیەکی گاڵتەیە لە رۆژئاوادا کە ساڵانە منداڵی ناشەرعی هەبێت لە ئافرەتان ناشەرعی، شانازیش دەکەن بەو سیفەتەی خۆیان(کەڵ)، رۆژئاوا دەڵێت (رێ بدە تۆوی خۆی برژێت، بەڵام رێ مەدە بەرپرسیار بێت).

ئیسلام دەڵێت (وابکە پیاو بەرپرسیار بێت لە چێژەکانی)، هەندێ پیاو هەن ئامادەن بەرگەی بەرپرسیارێتی گەورە بگرن و هەنێ ئافرەتیش هەن ئامادەن هاوشانی پیاو ئەرك بگرنە ئەستۆ، ئیتر بۆچی بەربەست بخەینە بەردەمیان؟ ئێوە گاڵتەتان دێت بە فرەژنی و بەو پێغەمبەرانەش کە لە کتێبی پیرۆزدا باسیان هاتووەو پەیرەویان کردووە، ئەی بیرتان چووەتەوە سولەیمانی دانا هەزار ژن و هاوسەری هەبووە وەك لە سیفری (جید 1 الملوك 11: 3) دا هاتووە، فرەژنی چارەسەری دروستی کێشە مەترسیدارەکەتانە، هێشتا ئارەزووبازی ناسروشتی و چاوەزیتەی هاورەگەزبازەکانتان ماوە.

دەی ئەو لادانە چیە؟ لە سەردەمی عیسادا جوولەکەو بتپەرستەکانیش مەسەلەی فرەژنی هەبوو و عیسا قسەیەکی نەبوو دژیان، هەڵەی ئەویش نەبوو، بەڵکو جوولەکە رێی نەدا چارەسەر پێشکەش بکات، بەڵام هاواری سروشتی خۆی کرد(هەرکات ئەو روحە حەقە هات ئەو رێنموونیتان دەکات بۆ هەموو حەقێك–راستیەك–) (یووحەننا 16: 13).

موعزی پیاوە:

ئەگەر ئازادانە ئامادە بوویت مەسەلەی پێشبینیەکە بخەیتە بەرباس و لە راناوەکان ورد بیتەوە، ئەوە بێ دوودڵی هاورای ئەوەیت کە ئەو موعزیەی بڕیارە بێت پیاوە نەك رۆحێك بێت.

(ئینجا هەرکات ئەو رۆحە حەقە هات ئەوە رێنموونیتان دەکات بۆ هەموو حەقێك، چونکە ئەو لە خۆیەوە قسە ناکات، ئەوەی دەیبیستێت ئەوە دەڵێتەوەو هەندێ شتی دواترتان پێ دەڵێت) (یوحەننا 16: 13).

بێزەحمەت راناوەکانی ئەو رستەیە بژمێرە، هەموویان راناون بۆ تاك و لە شەست و شەش کتێبی سیفرەکانی کتێبی پیرۆزی پرۆتستانتی یان حەفتاو سێ کتێبی سیفرەکانی کتێبی پیرۆزی کاسۆلیکی رایەکی تر نابینیت.

کاتێك لە هیند مشتومڕ کرا لەسەر ئەو راناوە نێرانە لە یەك دێڕی کتێبی پیرۆزدا کاتێك لەگەڵ موژدەبەرە مەسیحیەکاندا مشتومڕیان بوو و دەیانزانی ئەو موژدەبەرانە نوسخە نوێکەی کتێبی پیرۆزیان بە زمانی ئوردی گۆڕیوە بۆ راناوی مێینە، ئیتر بەو کارەیان موسڵمانان ناتوانن بانگەشەی ئەوە بکەن پێغەمبەرایەتیەکەی ناو پێشبینیەکەی کتێبی پیرۆز موحەممەد دەگرێتەوە، من خۆم لە نوسخەی ئوردی کتێبی پیرۆزدا ئەو فێڵ و سەرلێشێواندنە مەسیحیەتم دیوە، ئەم فێڵە لەنێو مەسیحیەکاندا باوە، بەلام لە زمانە گشتیەکاندا زیاتر باوە، ئەمەش دواجار لە نوسخەی ئەفریقیشدا کرا کە موعزییان کردبووە نێ٫ەندێ و دەستەواژەی روحولقودسیان دەستکاری کردبوو لەکاتێکدا هیچ زانایەکی کتێبی پیرۆز نەیوێراوە لە هیچ نوسخەیەکی ئینگلیزی کتێبی پیرۆزدا دەستکاری بکات، تەنانەت دەستەی (شەهیدانی جیهوافاه)[1] یش دەستکارییان نەکردووە، ئیتر مەسیحیەکان ئاوا دەکەن بە فەرمایشتەکانی خوا.

تاکە شوێنێکی تر کە نووسەر بێ ئەوەی مەبەستی بێت وەسفی پێغەمبەر موحەممەد بکات لەم دەقەیدایە کە راناوی نێرینەی زۆری بەکارهێناوە: (مەزاجی میانەڕەوی و دنیانەویستی لە هەڵسوکەوتیدا و پاکێتی

---

[1] - ئەمانە دەستەیەکی مەسیحی خراپ بوون کە لە وەرگێڕانی کتێبی پیرۆزدا دەستکاری چەمکەکانیان دەکرد.

لە ژیانیدا و چاکەکاری دووبارەوەبووی و دلچسۆزی بەردەوامی و هەستی یەکلایەنەی بە ئەرکەکان وایکرد سەرکەوێت، ئیتر لەنێو هۆزەکەی خۆیدا دۆست و دوژمن بە سپاردەکار ناویان دەبرد و جێی مەتمانە بوو).[1] (سعید أمین علی: روح الاسلام، ص 14)

(سپاردەکار) واتە دڵسۆز و جێمتمانە(روحولحەق) (یووحەننا 14: 17)

ئەم دەربڕینە ڕێگەیەکی مەجازیە بۆ ئەو قسەی دەڵێن حەقیقەت دەڵێا تا سیفەتێکی چەسپاو بێت پێوەی، بە جۆرێ خەڵکی وەك حەقیقەتێکی نیشاندراو تەماشای دەکەن، بە تەواوەتی وەك ئەوەی عیسا سەبارەت بە خۆی دەڵێ: (من ئەو ڕێگەو حەق و ژیانەم) (یووحەننا 14: 6).

هەموو ئەو سیفەتە جوانانە خۆیان لەوەدا دەبیننەوە کە دەفەرموێت شوێنم بکەون بەڵام (هەرکات روحولحەق هات ئیتر ئەو ڕێنموونیتان دەکات بۆ هەموو حەقێك) (یووحەننا 16: 13).

ئەوکات پێویستە شوێن ئەو بکەون، بەڵام مۆرکەکان بە سەختی دەسڕێنەوە، بۆیە پێویستە هەوڵی زیاتر بدەین، بەڵام بڕوام پێ بکە دەتوانین بە کەمتر لەو هەوڵەی مەسیحیەکان دەیدەن جیهان بگۆڕین.

---

[1] - کێشەکە لەوەدایە لە زمانی کوردیدا راناوەکان بۆ نێرو مێ دەرناکەون، بۆیە لەوانەیە خوێنەر مەسەلەکەی زۆر لا روون نەبێت. وەرگێڕ

سەرچاوەی سروش:

(هەرکات ئەو روحە حەقە هات ئیتر ئەو رێنموونیتان دەکات بۆ هەموو حەقێك، چونکە ئەو لە خۆیەوە قسە ناکات و ئەوی دەیبیستێت دەیڵێت و هەندێ شتی دواترتان پێ دەڵێت) (یووحەننا 16: 13).

زۆر هەوڵمدا لە سەرەتاوە تا کۆتا نوسخەکەی مەلیك جیمس بەکاربهێنم، بەڵام بۆ بەرچاورووونی زیاتر هەندێ نوسخەی ترم هێناو بەکارهێنا تا ئەم رستانەی خوارەوەیان لێ وەربگرم:

(چونکە دواتر ئەو هەرگیز لە قەڵەمڕەوی تایبەتی خۆی قسە ناکات، بەڵکو تەنها ئەوە دەڵێت کە بیستوویەتی) (کتێبی پیرۆزی ئینگلیزی نوێ).

(دواتر لە تایبەتمەندی خۆیەوە قسە ناکات، بەڵکو ئەوە دەڵێت کە بیستوویەتی) (نوسخەی نوێی نێودەوڵەتی).

(ئەو دواتر -کە دێت- هەرگیز بیروڕای تایبەتی خۆی پێشکەش ناکات، بەڵکوئەوەی بیستوویەتی بۆتان دەخاتەڕوو) (کتێبی پیرۆزی زیندوو).

جا ئەو روحولحەقە ئەو پێغەمبەرە حەقە سپاردەکارە هیچ شتێ لە خۆیەوەو لە بیری تایبەتی خۆیەوە ناڵێت، بەڵکو بە هەمان یاساو بنەمای موعزی پێشوو -عیسا پێغەمبەر- قسە دەکات کە دەڵێت (بە دڵنیاییەوە من لە خۆمەوە قسە ناکەم، بەڵکو باوك منی ناردووە، وەسیەتەکانی پێ

بەخشیوم، چی بڵێم و چ قسەیەك بکەم ... باوك چۆنی پێ وتووم ئاوا قسە دەکەم) (یووحەننا 12: 49–50).

بە هەمان شێوە لە قورئاندا هەمان شایەتی هاتووە بۆ پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ):

﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ﴿٥﴾ ﴾ النجم: ٣ - ٥

(وە لەهەواو هەوسەوە قسە ناکات کە قورئان دەخوێنێت، هەرچی دەیڵێ (قورئانەو) سرووش دەکرێ بۆی، جوبرەئیلی زۆر بەتوانا فێری کردووە)

ئەمە چۆنێتی پەیوەندی خوایە لەگەڵ هەموو پێغەمبەرانی، چ ئیبراهیم بێت یان مووساو عیسا، نامەعقووله وا بیر بکەیتەوە روحولحەق هەمان روحولقودسە، چونکە ئێمە پێمان وتراوە ئەو (هەرگیز لە ئارەزووی خۆیەوە قسە ناکات، بەڵکو بەوەی کە بیستوویەتی)، بە دڵنیاییشەوە وایە.

خوا و سیانە خوایی

لە ئاستی جیهاندا ئەوە یەکلایە کە هەموو مەسیحیە ئەرسەدۆکسەکانی جیهان بڕوایان هەیە بە سیانەی پیرۆز، (باوك خوایەو کوڕ خوایەو روحولقودس خوایە) بەڵام ئەوانە سێ خوا نین، بەڵکو یەك خوایە؟ ڕێ بدەن زانایەکی زۆر شارەزای لاهووتی مەسیحی وەك قەشە دۆمیللۆ باسی سیانە خوایی مەسیحیمان بۆ بکات کە پێی وایە بەشبوون و توانەوە نایگرێتەوە، ئەمەش لەسە وشەی (سنأتی) کە لە یووحەننادا (14: 23) هاتووە: (لەهەرکوێ کوڕ هەبێت پێویست دەکات باوکیش بوونی هەبێت، وێڕای ڕۆح، چونکە هەرسێیان یەکێکن، بەڵام لە سێ شێوەی بووندا، سێ دیمەنی بوونی خودایی، ئەو دێڕە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە سیانەی پیرۆز جیانەبووەوەن و تەواوکەری یەکدین، تکایە هیچ مەڵێ، تۆ ناتوانیت لەو قسە بالآیانە تێبگەیت، بە کورتی مەسیحیەت بڕوای بەوەیە (سیانە خوایی هەیە)(ببورە کە مەسیحی دەڵێت یەك خوایەو لە سێ بەشی جیادا) هەر سێیان دەبێت تەواوی بوون و شارەزا بە هەموو شتێك بن، ئەمە دەمانگەیەنێتە ئەنجامێکی پێکەنین و گاڵتەجاری، عیسا –بەپێی مەسیحیەت– لەسەر خاچ لە کالفاری سزا درا، جا کە دەڵێن ئەو سیانە جیا ناکرێنەوە، دەبوو باوك و روحولقودسیش لەگەڵ کوڕدا سزا بدرانایەو کاتێك ئەو مرد ئەو دوانەی تریش بمردنایە، سەرمان سوڕدەمێنێت کاتێك هاواری ڕۆژئاوا دەبیستین(خوا مردووە) کەچی پێناکەنن، ئەمە زیاتر وامان لێدەکات هەست بە بەرپرسیارێتی بکەین لە ڕزگارکردنی برا مەسیحیەکانمان لەو زەلکاوە ڕۆحیەی خەریکە تیایدا دەخنکێن.

# باسی پێنجەم:

# پێشبینیە بەدیهاتووەکان

(هەواڵی هەندێ شتی دواترتان پێ دەدات) (یووحەننا 16: 13)

پەنایەر (تەنها بۆ ماوەیەك):

مەسیحیەکان قورساییەکی زۆریان لەسەر بەدیهاتنی پێشبینیەکانە، موحەممەدیش(ﷺ) چەندین پێشبینی ناو عەهدی قەدیم و عەهدی جەدیدی بەدیهێناوە، لای ئەوانیش پێشبینی رووداوەکان ئەرکی پێغەمبەرایەتی حەقە.

پێغەمبەری ئیسلام چەندین پێشبینی باسکردووە کە قورئانی پیرۆز تۆماری کردووە بۆ نەوەکانی داهاتوو، ئەمە چەند نموونەیەکی کەمن کە بێ بەرنامە دامناون:

خوا دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ ﴾ القصص: ٨٥

(بێگومان ئەو (خوایەی) کە قورئانی بۆ تۆ ناردووە (پێویست کردووە) دەتگێڕێتەوە بۆ مەککە)

مەبەست بە مەعاد واتە شاری پیرۆزی مەککە، جا کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لە مەککەوە دەرچوو بۆ مەدینە، کەس نەبوو سەرخەری بێت، زۆربەی هاوەڵانی پێش خۆی کۆچیان کردبوو بۆ مەدینە، ئێستاش سەرەی خۆی هاتبوو، لەگەڵ ئەبووبەکر گەیشتنە شوێنێ کە پێی دەوترێ جوحفە، ئەوکات بەڵێنی خوایی هات کە دەگەڕێتەوە بۆ مەککەی شوێنی لەدایکبوونی، ئەوەش روویدا، وەك پەنابەر دەرچوو و وەك رزگارکەر خوا دەیگێڕێتەوە، پێشبینیەکی تری هێنایە دی.[1]

(-مووسا- وتی پەروەردگار لە سینائەوە هات و وەشع لێرەوە لە شاخی فارانەوە دەرچوو، -موحەممەد- لەگەڵ دەهەزار لەخواترس لە راستیەوە هات، یاسایەکی ناوازەی هێنا بۆیان) (سیفری التپنیە 33: 2).

[1] - بۆ وردتر خوێندنەوەی ئەو پێشبینیانە بڕوانە کتێبی (موحەممەد (ﷺ) لە کتێبی پیرۆزدا) کە عەبدولحەمید داود قەشەی پێشووی ئارامی نووسیویەتی.

## هێزە گەورەکان لە جەنگدا!

**خوای گەورە دەفەرموێت:**

﴿ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ﴿٣﴾ فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿٤﴾ ﴾ الروم: ٢ - ٤

**(ڕۆم شکێنران و ژێرکەوتن (فارس زاڵ بوو) بە سەریاندا، لە نزیک ترین خاکیان (لە مەککەوە یا لە وڵاتی فارسەوە) وە ڕۆمەکان دوای تێش‌کانیان لە داهاتوودا سەر دەکەون (بەسەر فارسەکان) دا، لەماوەی چەند ساڵێکدا (لە نێوان سێ تا نۆ ساڵ) هەموو کاروبار تەنها بە دەست خوایە لە پێش (سەرکەوتن) و لەدوا (سەرکەوتن) وە لەو ڕۆژەدا (ڕۆمەکان سەردەکەون) ئیمانداران دڵخۆش دەبن).**

**ئەم پێشبینیانە لای خواوە دابەزین بۆ سەر موحەممەد (ﷺ)، ئەمەش لە ساڵانی 615–616ی زاینی، ئیمپراتۆریەتی مەسیحی ڕۆمانی لە بەرامبەر فارسەکاندا قودسی لەدەست داو ئابڕووی مەسیحیەت لەناو خۆڵدا گەوزا، ئەو کارەساتەی نێوان ئەو دوو هێزە گەورەش لەو کاتانەدا بوو کە بتپەرستانی**

ناو مەککە خۆشحاڵییان دەربڕی بەرامبەر شکانی ڕۆمانەکان لەسەر دەستی فارسە بتپەرستەکان.

(عەرەبە بتپەرستەکان هەواداری فارسەکان بوون و پێیان وابوو لەناوچوونی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی واتە شکستی پەیامی پێغەمبەر(ﷺ) (جێگرەوەی حەقی مەسیح)... لەکاتێکدا هەموو جیهان بڕوای وابوو ئیمپراتۆریەتی ڕۆم بەدەستی فارسەکان لەناوچووە، خوا سروشی نارد کە سەرکەوتنی فارسەکان زۆر ناخایەنێت و لە ماوەیەکی کەمدا جارێکی دی ڕۆمەکان سەردەکەونەوەو مەرگ دەخەنە ناو فارسەکانەوە).[1]

لەماوەی دە ساڵدا موعجیزەکە هاتە دی و بەڵێنی خوا هاتەدی.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی قورئانی پیرۆز لەلایەن پەروەردگارەوە بۆی دابەزیوەو جوانی و سروشت و ئەو ڕاستیانەی لە قورئاندا هەن بەڵگەی ئەوەیە کە لای خواوە دابەزیوە، بۆ سەلماندنی ڕاستی بانگەوازەکەی، چەندین سوورەتی خستووەتە بەردەمت، ئایا کەس دەتوانێت نموونەی یەك سوورەتیان بهێنێت؟ ئەمەش تەحەددایەکی گەورەیە، پێشبینیەکی هەمیشەیی و کۆتانەهاتوو کە هەموو مرۆڤایەتی ناتوانێت نموونەیەکی سوورەتێك بهێنێتەوە.

---

[1] - عبدالله یوسف علی.

بیانووی ئەوە کە عەرەبی نازانیت بیانوویەکی دوابڕاوە، چونکە ملیۆنەها مەسیحی عەرەب هەن کە ئێستا دەژین، مەسیحیەکان شانازی بەوەوە دەکەن دە تا پانزە ملیۆن مەسیحی قیبتی تەنها لە میصر هەن، هەموو ئەوانە جووتیار نین، خوا بەمجۆرە تەحەددا دەکات:

﴿ وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ یونس: ٣٧

(ڕەوا نییەو ناگونجێ ئەم قورئانە هەڵبەسترا بێ (لە لایەن کەسێکەوە) جگە لەخوا)

﴿ قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴿٨٨﴾ ﴾ الإسراء: ٨٨

(ئەی (موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)) بڵێ سوێند بەخوا ئەگەر ئادەمی و پەری هەموو کۆببنەوە بۆ ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بێنن ناتوانن وێنەی ئەو بێنن هەرچەندە پشتیوانی یەکتریش بن.)

﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ ﴾ یونس: ٣٨

(یان دەڵێن (موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)) خۆی ئەم قورئانەی هەڵبەستووە بەدەم خواوە بەوانە بڵێ سورەتێك بهێنن وەك ئەو و هەرکەسێك کە دەتوانن بانگی بکەن بێجگە لەخوا ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن.)

﴿ وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾ البقرة: ٢٣ ـ ٢٤

(وەئەگەر ئێوە لەگوماندان لەم (قورئانەی) کەناردومانەتە خوارەوە بۆ بەندەی خۆمان(موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) دە سورەتێك بێنن بەوێنەی ئەو،وە بانگی هاوکارەکانتان بکەن( لەڕەوان بێژان وشاعیران) بێجگە لە خوا ئەگەر ڕاست دەکەن، بەفەرموودەی خوای نازانن، ئینجا ئەگەر ئەمەتان نەکرد؟ وەهەرگیز نایشی کەن (ئیتر بێ بڕوامەبن) دەی خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی کە سوتەمەنیەکەی خەڵك(ی بەدکار) وبەردە بۆبێ بڕوایان ساز کراوە یان ئامادە کراوە) .

ئێستا وا چواردە سدە تێپەڕ بووە بەسەر ئەو تەحەددایەدا، بەلام یەك کەس نەیتوانیوە شتێکی باشتر یان وەك سوورەتێکی قورئان بەرهەم بهێنێت، ئەمە شایەتیەکی هەمیشەیی و دوانەهاتووە لەسەر ئەوەی سەرچاوەی قورئانی پیرۆز خواییە.

عەرەبە مەسیحیەکان هەوڵیاندا:

مەسیحیە عەرەبکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کەم نەبوون، لە شانزە پرۆژەدا دەستیان پێکرد و برێ هەڵبژاردەی ناو عەهدی جەدیدیان بە زمانی عەرەبی کۆکردەوەو برێ وشەو رستەی جوانی ناو قورئانی پیرۆزیان هێنا، هەوڵێکی گەمژانە بوو، چونکە بێ ئەوەی شەرم بیانگرێت لە سەرەتای هەموو ئیصحاحێکی ئەم عەهدە جەدیدەیان کە بە زمانی عەرەبی نووسیویانە وەك قورئانی پیرۆز دەست پێ دەکات (بسم الله الرحمن الرحيم)

ئایا نکوولّی لەوە دەکەیت؟ بەدواداچوونی بۆ بکە.

چەندین تەحەددای ترو پێشبینی و هەواڵی پێشوەختە لە قورئانی پیرۆز و سووننەتدا هەن کە دەکرێت باس بکرێن، بەڵام پێویستی بە نووسینێکە لەو بوارەوە، من دڵنیام زانایانی موسڵمان ئەو کارە کەدەن، بەڵام رێ بدەن من بە پێشبینیەکی تری قورئانی پیرۆز کۆتایی بە باسەکە بهێنم.

ئیسلام زاڵ دەبێت:

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الصف: ٩

(خوا ئەو زاتەیە کە پێغەمبەری خۆی ناردووە بە ڕێنموونیی و ئایینێکی ڕاست و دروستەوە تا بەسەر هەموو ئایینێکدا سەری بخات هەرچەندە هاوبەش پەیداکەرانیش پێ یان ناخۆش بێ.)

لەماوەی چەند دەیەیەکدا ئەو بەڵێنە پێشینە بوو بە ڕاستی و ئیسلام سەرکەوت و هەردوو هێزی گەورەی ئەوکات لەسەر دەستی موسڵمانان رووخان کە بریتی بوون لە ئیمپراتۆریەتی فارسی و ڕۆمی، هێزی ئیسلام ماوەی چەند سەدەیەك هەژموونی هەبوو هەر لە زەیای ئەتڵەسیەوە تا زەیاری باسیفیکی.

بەداخەوە موسڵمانانی ئەمڕۆ خەوتوون، بەڵام هێشتا گەشبینین، جیهانی ئیسلامی دەکەوێتەوە سەرپێ، تەنانەت کەسە ناموسڵمانەکانی رۆژئاواش پێشبینی ئەوەیان کردووەو دەکەن کە ئیسلام بەم زوانە سەردەکەوێتەوە.

ئەفریقیا نێوەندێکی دادپەروەرانەیە بۆ هەموو ئایینەکان، بەڵام ئەو دینەی تاکی ئەفریقی قبووڵی دەکات ئەو دینەیە کە لەگەڵ چاکترین پێداویستیەکانی بگونجێت، ئایینێکیش کە هەموو کەسێك تیایدا مافی ئەوەی هەبێت لە باسی جێخواسی خۆیدا قسە بکات ئایینی ئیسلامە.[1]

---

[1] - هـ.ج.ویلز.

ئەگەر ئایینێ هەبێ لەماوەی سەد ساڵی داهاتوودا ئینگلتەراو بەڵکو ئەورووپاش بگرێتەوە بە دڵنیاییەوە ئەو ئایینە ئیسلام دەبێت.[1]

بێ ئەوەی موسڵمانان هەوڵێکی وا بدەن، بیستوومانە لە خودی ڕۆژئاواییەکان کە ئیسلام لە جیهاندا لە هەموو ئایینەکانی تر گەشەی خێراترە، هیوام وایە ئەو هەواڵە دڵخۆشکەرانە بەرەو خەواڵوویمان نەبەن، بەڵێنی خوا حەقە و قەزاو قەدەری خوایش ڕێی خۆی دەبڕێت، تەنها لەسەرمانە کەمێك هەوڵ بدەین، خوا دەتوانێت بە ویستی خۆی گەلان بێنێتە ناو ئیسلامەوە، بەڵام شەرەفی خزمەتکردن بەم ئایینەی پێ بەخشیوین بە قوربانیدانە شەخسیەکانمان، تۆیش بۆ ئەوەی سەربازێکی ئەم جەنگە بیت، بە لەبەرکردنی دێڕی (یووحەننا 16: 7) بە زمانێ یان چەند زمانێ خۆت پڕچەك بکە، بزانە چۆن خوا زانستێکی بەسوودی پێ بەخشیویت، توانیومانە زاڵ بین بەسەر هەموو بیروباوەڕێکدا، واز بێنە لەو ناباوەڕدارەی ڕقیەتی لە پەیامی ئیسلام.

---

[1] - جۆرج برناردسۆ.

بەرزراگرتنی عیسا:

(ئەو-روحولحەق- بەرزم رادەگرێت(عیسا) چونکە ئەوەی بۆ منە دەیگرێتەبەرو پێتان دەڵێت) (یووحەننا 16: 13).

ئەمە بەڵێنێکی موعزیو رۆحولحەقیشە کە وێنەی حەق دەنوێنیێ، کاتێك دێت شایەتیەکی حەقی پێیە لەسەر مەسیح، پاکی رادەگرێت لەو تۆمەتانەی بۆی هەڵبەستراوە.

دەی ئەوە موحەممەدی ئەمینە، پێغەمبەری حەقە، سەرکەوتوو بوو و کارێکی کرد کە ئەمڕۆ یەك ملیارد موسڵمان بڕوایان هەیە بە عیسای مەسیح و بە یەکێك لە پێغەمبەرانی ئولوعەزمی دەزانن و بڕوایان هەیە بە لەدایکبوونی، چەند مەسیحی ئەمڕۆ و هەروەها ئوسقوفەکان هێشتا بڕوایان پێی نیە، موسڵمانان بڕوایان هەیە بە موعجیزە زۆرەکانی مەسیح، لەوانەش زیندووکردنەوەی مردوو بە فەرمانی خوا و چاککردنەوەی نابینا و کەسی گولبوو بە ئیزنی خوا، دەی شایەتی لەوە گەورەتر؟ با گوێ لەم دەستەواژانەی بەسەرهاتی موژدەدانەکەی بگرین:

﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَرۡيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتۡ مِنۡ أَهۡلِهَا مَكَانٗا شَرۡقِيّٗا ﴿١٦﴾ فَٱتَّخَذَتۡ مِن دُونِهِمۡ حِجَابٗا فَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرٗا سَوِيّٗا ﴿١٧﴾ قَالَتۡ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا ﴿١٨﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمٗا زَكِيّٗا ﴿١٩﴾ قَالَتۡ

أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا ﴿٢٠﴾ قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ
هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِّلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا ﴿٢١﴾ ۞ فَحَمَلَتْهُ
فَانتَبَذَتْ بِهِ مَكَانًا قَصِيًّا ﴿٢٢﴾ ﴾ مريم: ١٦ - ٢٢

(ئەی (موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)) باسی بەسەرهاتی مەریەم بکە لە قورئاندا ئەو کاتەی کە کەنارگیری کرد لە کەسوکاری لە شوێنێکی ڕۆژهەڵاتی (مزگەوتی قودسدا خوا پەرستی) دەکرد، ئینجا پەردەیەکی دانا لە نێوان خۆی و ئەوان (کەسوکاری) دا ئێمەیش جوبرەئیلمان نارد بۆلای وەکو بەشەرێکی تەواو خۆی پیشانی (مەریەم) دا، مەریەم وتی من پەنا دەگرم بەخوای میهرەبان لە تۆ ئەگەر تۆ لە خوا ترسیت (وازم لێ بێنە و زیانم پێ مەگەیەنە، جوبرەئیل وتی (ترست نەبێ) من نێردراوی پەروەردگارتم بۆ ئەوەی منداڵێکی پاك و خاوێنت پێ ببەخشم، مەریەم وتی من چۆن منداڵم دەبێت !! کە هیچ بەشەرێك ڕەفاقەتی نەکردووم (بە حەڵاڵی) وە داوێن پیسیش نەبووم، فریشتەکە وتی کارەکە بەو جۆرەیە (کە پێم وتی) پەروەردگارت فەرموویەتی ئەو کارە لای من زۆر ئاسانەو بۆ ئەوەی بیکەین بە موعجیزەو نیشانەیەك بۆ خەڵکی و ڕەحمەتێکی تایبەتیش لەلایەن ئێمەوە ئەوە کارێکی بڕیار دراوە (لەلایەن خوا) وە، جا (مەریەم) سکی پڕ بوو بەو (کۆرپەلەوە) ئینجا بە (سکەکە) وە دوور کەوتەوە بۆ شوێنێکی دوور (لە کەسوکار) ی)

لەم ساتەدا یەك ملیار موسڵمان هەن بڕوایان هەیە بەوەی عیسای مەسیح بە پاکی لە سکی مەریەمدا بووە، ئەمەش لەسەر فەرمایشتی پێغەمبەر(ﷺ)، جا عیساو مەریەمی دایکی و هەموو جیهانی مەسیحی ناتوانن بەپێی پێویست سوپاسگوزاری پێغەمبەر(ﷺ) بکەن.

وەلامی جوولەکە بۆ عیسا!

(ئەی ئوورشەلیم، ئەی ئوورشەلیم، ئەی بکوژی پێغەمبەران و رەجمکەری بۆ نێردراوانی، چەند کت بووە من-عیسا- بە یەکسانی هەموو رۆڵەکانتم کۆکردووەتەوە وەك چۆن مریشك جووجکەکانی لەژێر باڵەکانیدا کۆدەکاتەوە، بەڵام تۆ وازت لێ نەهێنام) (مەتا 23: 37).

وەك چۆن مریشك دەچێت بەدوای جووجکەکانیدا، پێغەمبەری گەورە ئاوا چوو بەدوای جوولەکەدا، بەڵام ئەوان وەك داڵ دایان بەسەریدا تا پارچەپارچەی بکەن، تەنها بەو هێرشە دڵرەقانەو تەنگپێهەڵچنین و هەوڵی کوشتنەی نەوەستان، بەڵکو دایکیشیان تۆمەتبار کرد بەوەی بە تاوان و بە ناشەرعی سکپڕ بووە:

﴿ وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَانًا عَظِيمًا (١٥٦) ﴾ النساء: ١٥٦

چ جۆرە بوهتانیکی گەورەیان کرد، پێغەمبەر(ﷺ) بە سروشی خوایی ئەوەی باسکردووە کە دەیانوت: (یا أخت هارون..بغیا) (مریم: 28).

## تلموودیەکان چی دەڵێن؟

جوولەکەکان عیسا بەوە تۆمەتبار دەکەن کە بە شەرعی لەدایك نەبووەو مەریەم بە زیناکار ناو دەبەن و بە گومانن لە پاکداوێنی ئەو ئافرەتە، قورئانی پیرۆزیش روون و ئاشکرا بەرپەرچی ئەو بوختانە دەداتەوە، ئێستا بەراوردی فەرمایشتی قورئان بکە لەگەڵ وتەکەی قەشە شارەزاو بەناوبانگەکە(دۆمیللۆ) کە شانزە کاهینی مەسیحی ئیکلیرکی پاڵپشتی دەکەن، ئەمە گوڵبژێری وتەیان بووە بۆ تۆمەتی دوژمنانی عیسا بەرامبەر بە عیسا: (تلموودیە جوولەکەکان دەڵێن کوڕی زینا–واتە لە مەریەمی عەزرا–موعجیزەیەکی لە میصر کرد بە پارچەپارچەکردنی گۆشتی، عیسا خۆی رادەهێنا لەسەر فێڵ و جادوو و ئیسرائیلی بەرەو بتپەرستی برد، بەڵام ئەوەی جێی دڵخۆشیە موحەممەد(ﷺ) بە توندی بەرپەرچی ئەو بوختانە جوولەکەییە دەداتەوە).[1]

---

[1] - تعليق دوميللو على الكتاب المقدس، ص 668.

مژدەبەرانیش هاوڕای جوولەکەن:

جۆن ئێم سی کە دەرچووی کۆلێژی ویستۆنەو پلەی نایابی بەدەستهێناوە لە پەیمانگەی تالبوتی لاهووتی و ناسراوە بەوەی وانەی وتوەتەوە بە زیاتر لە پێنج ملیۆن خوێندکارو ئامادە بوو و لە زیاتر لە 550 زانکۆی ناو پەنجاو سێ دەوڵەتدا وانەی وتووەتەوە، لە هەموو زانایانی تری ئینجیل توێژینەوەی کردووە لە باسی(ئەوەی تلموودی جوولەکە دەیڵێت سەبارەت بە لەدایکبوونی مەسیح).

کتێبێکی هەیە بەناوی (البینه تحتاج دلیلا)، تەنعا بۆ سەلماندنی ئەوەی عیسا ئەفسانەیەك نەبووە، بەڵکو کەسایەتیەکی مێژوویی بووە، بێ هیچ بەربەستێ لە تلموودی جوولەکەوە بەڵگە دێنێتەوە، وا لە خوارەوە کورتەیەکی پوخت لە وتەکانی ناو کتێبەکەی دەخەمە بەرچاو:

تولا دۆس یشیۆ: عیسا وای پێ دەوترێ کە کوری ئافرەتێکی زیناکەرە، یب 1، ج3، 49 أ:

شیمۆنی کوڕی غازی سەبارەت بە عیسا دەڵێت: لە دەستنووسی رەچەڵەك لە قودس کە هەر لەوێ ئەو دەستنووسە تۆمار کراوە هاتووە کە عیسا بە ناشەرعی و بە ناپاکی لەدایك بووە).

جۆزیف کلۆسنەر: لە چاپێکی زیادەی میشنا هاتووە پرسیار کرا کێیە کوڕی زیناکەرەکە؟ لە وەڵامدا هەر کەسێکە باوك و دایکی لە ئەنجامی ناپاکیەوە یاسایان کوشتووە، گومان لەسەر عیسایە...).

جۆش ئیم سی دویلی گەورە موژدەبەری مەسیحی و پەرستیاری مەسیح و کاتێك بوختانەکانی دوژمنان دژ بە سەیید و خواکەی-عیسا- دینێتەوە زمانی گۆ ناکات، کتێبەکانیشی لە جیهانی مەسیحیدا لە پڕفرۆشترین کتێبەکانن، کەچی گومان هەیە لە خۆشەویستی بۆ مەسیح.

پێم باش نیە ئیتر چیرۆکی پیس و گەنی ئەوانە بە نموونە بهێنمەوە، جا ئەگەر عیسا پێغەمبەر دۆستی دڵۆزی ئاوای هەبێت دوژمنی بۆ چیە؟

موحەممەد (ﷺ) هاوڕێی راستگۆ و موعزی و هاوکار و پارێزەر و بەرزراگرە، شاهیدیشە بۆ ئەو پێشبینیانەی لە یوحەننا(ئیصاحەکانی 14 و 15 و 16 ) دا هاتووە، ڕێ بدەن هەمان وتەکەی دۆمیللۆی نەیاری موحەممەد(ﷺ) دووبارە بکەمەوە کە موحەممەد (ﷺ) چەند چاك بووە بەرامبەر بە عیسا و مەریەمی دایکی و هەمو مرۆڤایەتی (ئەوەی جێی دڵخۆشیە موحەممەد(ﷺ) بە توندی بەرپەرچی ئەو بوختانە جوولەکەییە دەداتەوە).

دەمارگیری:

ئێستا ڕێ بدەن دەرفەتی روحولحەق بدەین تا گیانی دەمارگیری جوولەکەو مەسیحیەکانمان بۆ باس بکات و پێوەرێکی راستمان بۆ مەسیح پێ بدات، جوولەکە دەڵێن عیسا بە ناشەرعی لەدایك بووەو نەتوانراوە باوکی دەستنیشان بکرێت، مەسیحیەکانیش لەبەر هەمان هۆکار کردوویانە بە خوا و کوڕی خوا، تەنها ئایەتێك دێنینەوە تا ئەو درۆیە شەرمەزار بکات:

﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ﴿١٧١﴾ ﴾ النساء: ١٧١

(ئەی خاوەن پەڕاوە ئاسمانییەکان زیادە ڕەوی مەکەن لە ئایینەکەتاندا وە مەڵێن لە بارەی خواوە بێجگە لە ڕاستی بێگومان مەسیح عیسای کوڕی مەریەم تەنها پێغەمبەری خوایە(دروستی کردوە بە) وتەی خۆی(ببە) بە(جیبرییل دا) ناردی بۆ مەریەم و(عیسا) گیانێکە لە لایەن خواوە بەخشراوە کەواتە بڕوا بهێنن بە خواو پێغەمبەرانی وە مەڵێن(خواکانمان) سیانن (الله ، عیسی ، مریم)، (لەو وتەیە) کۆتایی بهێنن چاکترە بۆتان بێگومان خوا پەرستراوێکی تەنهایە پاك و بێگەردی بۆ خوا لەوەی ڕۆڵەی هەبێت هەر هی

خوایە هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لەزەوی دایە وە خوا بەسە چاودێربێ و هەموو شتێکی بدرێتە دەست.)

بەهۆی دەمارگیریەوە جار هەیە زیادەرەوی و کەمرەوی هەیە، بۆیە رۆچوونی خەڵك لە ئاییندا لەوانەیە بەرەو کوفر یان ئەوپەڕی گیانی دژایەتی ئاینیان بەرێت، زیادەرەوی جوولەکە لە مەسەلەی چینایەتی و رەگەزو رەگەزپەرستی و رەفزکردنی عیسای مەسیح لە چەندین شوێنی قورئاندا باسکراوەو رەخنەی لێگیراوە.

هەندێ ئاکاری مەسیحیەکانیش هەن کە رەخنەیان لێگیراوە، ئەوان عیسایان بردووەتە ئاستی خوا، هەندێ جار هێندە مەریەم بەر رادەگرن دەیبەنە ئاستی بتپەرستی و وەك بتێ دەیپەرستن، عیسا بە کوڕی سروشتی خوا دادەنێن و بیروباوەڕی سیانەخواییان داهێناوە، تەواو دژی عەقڵن، ئەمە هاوتای بیروباوەڕی دانیشتوانی ئەسینایە، ئەگەر بڕوا نەهێنن، ئەوە سەرەنجامیان دۆزەخی هەتاییە.

سیفەتەکانی مەسیح لە ئایەتەکەدا:

یەکەم: کوڕی مەریەمە، بۆیە پیاوە.

دووەم: پێغەمبەری خوایەو لەلایەن خواوە نێردراوە، بۆیە شیاوی گەورەیی‌و رێزدارییە.

سێیەم: وتەکانی گەیاندووە بە مەریەم و بە فەرمانی خوا(ببە دەبێت و بوویش) خولقێنراوە.

چوارەم: ڕۆحی پەیوەستە بە خواوە، بەڵام خوا نیە، ژیانی زیاتر لە باری هەندێ پێغەمبەرانی تر باسکراوە، هاوکات پێویستە وەك پێغەمبەرێکی خوا بەرزی ڕابگرین.

بیروباوەڕی سیانەخوایی بە کوفر دادەنێین و قبوولکراو نیە، خوا هیچ پێویستیەکی نیەو پێویستی بە منداڵ نیە تا کاروبارەکانی بۆ بەڕێوەببات.

## وتەی پێغەمبەر(ﷺ) نیە

کاتێك دەڵێیت هەموو ئایەتەکانی پێشوو کە باسمان کرد و ئایەتەکانی تری قورئان کە زیاد لە شەش هەزار ئایەت دەبن لە زمانی موحەممەدەوە(ﷺ) نووسراونەتەوە ئەوە متمانەیەکی زۆر زیاد دەبەخشێت، بەڵام خوای گەورە ڕوونی کردووەتەوە کە ئەوە وتەو پەیامی موحەممەد نیە، بەڵکو سروشە بۆی دابەزیوە (إن هو إلا وحي يوحى) (النجم: 4).

بە تەواوەتی هاوواتای پێشبینیەکەی عیسا پێغەمبەر: (چونکە ئەو لە خۆیەوە قسە ناکات، بەڵکو چی بیستووە هەمووی دەڵێت) (یووحەننا 16: 13).

مەسیحی (ترایلیما):

هەموو بەڵگەو بەرزراگرتنەکانی موعزی دواین(پێغەمبەر موحەممەد(ﷺ)) مەسیحیەکانی رازی نەکرد، چونکە موحەممەد (ﷺ) ملکەچی خواستەکانی ئەوان نەبوو، لای ئەوان رێزگرتن و بەرزراگرتن وایە عیسا بە خوا بزانیت، بۆیە لەنێو دوو شتی دژ بە یەکدا دوو بژاردەی قورسیان هەڵبژاردووە، مەرگی عیسا بە لەخاچدراوی وەك پیاوێ یان وەك خوایەك، ناوێکی نوێیان داهێناوە کە لە هیچ فەرهەنگێکی جیهاندا بوونی نەیەو بریتیە لە (ترایلیما)، جۆش ئێم سی دویل نویچنەری دەستەی خاچی نێودەوڵەتی بۆ یەسووعی مەسیح لە کتێبەکەیدا(البینە تحتاج دلیلا) چەمکی سروشێکی نوێی لە رێی روحولقودوسەوە هێناوە، ئەمە هەمان لەغزی عەجیبە لە باشی حەوتەمدا (ترایلیما خوایە یان درۆزنە یان شێت؟) جا ئێستا خۆت مەزندەی بکە، ئەو لە خوێنەرەکانی خۆی دەوێت وەڵام بدەنەوە عیسا خوایە یان درۆزنە یان شێت؟ ئەمە داهێنانە، هاورا نیت؟ موسڵمان ناتوانێت بڵێت عیسا درۆزنە یان شێتە، ئەی چی مایەوە، بەڵکو دوو بژاردە هەن، بەراستی ئەمە کوفرێکی زۆر گەورەیە، رۆجەر باکوون کە فەیلەسووفێکی هاوچەرخە دەڵێت (بۆ کەسێك سووتاندنی ماڵەکەی زۆر ئاسانترە لەوەی رزگاری بێت لە بیروراکانی پێشووی).

حیکمەتی منداڵ:

به کەسێك بڵێیت خوا یان کوڕی خوا یان بڵێیت باوکی بریتیه له خوا، ئەمه ڕێزپێدان و گەورەیی نیه، بەڵکو سووکایەتیه، جووتیارێکی فەرەنسی که ئەم جیاوازیه دەزانێت باشتره له ملیۆنەها زانایەم ەسیحی زۆر شارەزا که لەمڕۆدا لەسەر زەوین.

دیاره لویسی پانزەهەم کەسێکی زۆر فاسق بوو، ئافرەتێ نەبوو له دەستی پارێزراو بێت، دوای مردنی کوڕەکەی هاته سەر دەسەڵات، پڕوپاگەندەیەك بڵاو بوویەوه که کەسێکی تەواو هاوشێوەی پاشای بچووك بینراوه بەدەوری پایتەختدا پیاسەی کردووه، پاشاش بۆ دەرفەت دەگەڕا تا هاوشێوەکەی خۆی ببینێت، زۆری نەخایاند پیاوەکانی پاشا ئەو کابرا دەشتەکیەیان دۆزیەوەو هێنایانه بەردەم پاشا، پاشا سەری سوڕمابوو که چەنده له خۆی و باوکی دەچێت، به ڕێزەوه لێی پرسی ئایا له سەردەمی باوکمدا دایکت سەردانی پاریسی کردووه؟ کابراش وتی نا، بەڵام باوکم هاتووه، ئەوه تیرێ بوو بۆ پاشا، بەڵام ئەو سەرەا پرسیاری کرد سەبارەت به دایکی کابرا.

هەڵوێستی توندت نەبێت:

کینەی جوولەکە وایکردووە وا تانەی خراپ بدەن لە عیسا و دایکی، رۆچوونی زیادەی مەسیحیەکانیش بۆ عیسای مەسیح هەر خراپە، موحەممەد(ﷺ) ئیدانەی هەردوو هەڵوێستەکە دەکات و عیسای لە ئاستی شیاوی خۆیدا ناوبردووە وەك مەسیح و پێغەمبەر و چاکسازێ.

خۆشت بوێ و رێزی بگرەو بەرزی رابگرەو شوێنی بکەوە، بەڵام مەیپەرستە، چونکە پەرستش تەنها مافی خوایەو ئەو خاوەنی ئاسمانەکانەو خۆی خوایە.

ئەمەیە بەرزراگرتنی راست و دروست (ئەو رێزدار-بەرز-رامدەگرێت) (یووحەننا 16: 14).

هەم لە رووی مێژوویی و هەم ئەخلاقیو هەم لە رووی پێشبینیەکانەوە موحەممەد (ﷺ) کۆتا پێغەمبەری خوایەو روحولحەقەو تاکە کەسە کە پێشەنگی مرۆڤایەتی دەکات بۆ هەموو حەقێك، جێگرەوەی گەورەو سروشتی عیسای مەسیحە، قسەو تێبینی و رەخنەکانت قبووڵ دەکەم، بەڵام تەنها لێرە دامەنیشەو لەبەر خاتری خوا ئێستا لێ بنەوەو بجووڵێ.

## خوێنەری ئازیز

دیارە بانگەشەی مەسیحیەکان لەخشتەت دەباتو لەو باسەی پێشوو کە باسمان کرد لاتدەددەن، ئەمەش لەبەر بوونی ئەزموونی دەمارگیرییان، جەژنی دەمارگیری ئاهەنگێکی جوولەکەییە، لە رۆژی پەنجاهەمی پاش دروێنە ئەو ئاهەنگە دەکەن، جوولەکەکان لە هەموو لایەکەوە دێن بۆ قودس و لەوێش خواردن ئامادە دەکەن، پوترس لەگەڵ یانزە کەسەکە لەیەك شوێندا بوون، ئەوکات گەورە لە ئاسمانەکانەوە لە سەروو کۆرەکەیانەوە هاواری کرد، خەڵکی شڵەژان و بە زمان و شێوەزای جیا جیا قسەیان دەکردو ئەوەیان لا نامۆ بوو، هەندێ کەس سەری سوڕ دەما، هەندێ گاڵتەیان دەکرد، (دەیانوت هەموویان سەرخۆشن، ئەمە هەموو شتێ بوو، ئەوە یادی بابلی ناو بابلی بیر دەخستنەوە). (سیفی تەکوین 11: 9).

وەك شانۆییەکی تەواو سەرسوڕهێنەر پوتروس کە مامۆستا ئاماژەی پێکردبوو(خواردن بدە بەرخە بچووکەکەم... خواردن بدە بەرخە بچووکەکەم) (یووحەننا 21: 15–16).

هەستا تا بەرگری لە خوێندکارەکان بکات و دەیوت ئەو پیاوانە سەرخۆش نین، هێشتا زۆر زووە بۆ ئەوە، خەڵکی بەو زووییەی بەرەبەیان ناخۆنەوە)، (بەڵام ئەمە لەرێی پێغەمبەر جویلەوە وتراوە) (ألمپال 2: 16).

جەژنی دەمارگیری بەدیهاتنی پێشبینی پێغەمبەر جویل بوو، نەك پێشبینی عیسا پێغەمبەر، جیهانی مەسیحی بڕوای وایە پوتروس سروشی بۆ هاتووە تا ئەوە باس بکات، هەردووکیان فێڵی روونی روحولقودوسن، ئێمە لە هیچ شوێنێ یەك وشەش لەو نیەتەی ئەوانمان تۆمار نەکردووە، یان ئەوەمان نەوتووە کە ئەو حەواریانەی مەسیح سەبارەت بە جەژنی رەگەزپەرستی(دەمارگیری) وتوویانە، بەردەوام موعزی ئەو کەسەیە کە پێشەنگی هەموو مرۆڤایەتی دەکات بۆ هەموو حەقێك، هەمیشەش ئەوەمان سەلماندووە موعزی روحولقودوس نیە.

## باسی یەکەم: هەڵبژاردنی هەموو:

خوا دەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ القلم: ٤

چۆن باسەکە دەستی پێکرد:

نزیکەی دەساڵ لەمەوپێش ئامۆزایەکی دوورم کە مامۆستا موحەممەد موهتار فاروقیە، شایەتیەکی چاپکراوی مێژوونوسێکی فەرەنسی پێدام کە ئەویش لامارتین بوو، مەبەستی بوو بیسەلمێنێت موحەممەد (ﷺ) گەورەترین کەس بووە کە لەم ژیانەدا دەرکەوتووە، عادەتەن سەید موهتار زانیاری پێ دەبەخشیم، بڕوای وابوو من لە شوێنی خۆی زانیاریەکە دادەنێم و لە کاتو شوێنی گونجاودا بە باشی بەکاری دێنم، پێشتریش کتێبی (نداو المنار)ی پێ بەخشیم کە کتێبێکی ناوازە بوو و (باشیووب کینیس کراج) نووسیبووی، بە شرۆڤەی ئەو کتێبە، فێڵو لەخشتەبردنی لێزانانەی ڕۆژهەڵاتناسە مەسیحیەکانم بۆ دەرکەوت.

ستایشی لامارتین بۆ پێغەمبەرمان موحەممەد(ﷺ) کاری تێکردم، زۆرم پێ خۆش بوو کە سەبارەت بە پێغەمبەرمان (ﷺ) هاودەم بە برا موسڵمانەکانمان بیروباوەڕی خۆی نیشان بدایە، دەرفەتی وایش بەدوور نازانم.

لەلایەن کۆمەڵەی موسڵمانانی دینهاوسەرەوە پەیوەندیەکی تەلەفۆنیم بۆ هات، ئەو شارۆچکەیە لە کەناری باکووریەوەیە، لەوێ لەبەر یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر(ﷺ) ئاهەنگێکیان ساز کردبوو و منیان بانگ کرد تا لەو بۆنە خۆشەدا وتەیەك پێشکەش بکەم، منیش خێرا رازی بووم، کاتێك ویستیان دیدی من بزانن سەبارەت بەو بابەتەی نیازمەو بەتەمام باسی چی بکەم، منیش لەژێر کاریگەری لامارتیندا بابەتی (موحەممەد گەورەترینە(ﷺ))م پێشنیار کرد.

کە گەیشتمە دانهاوسەر بینیم چەندین پۆستەر هەڵواسراون سەبارەت بە دیدارەکە، کورتەکەشی ئەوە بوو کە دیدات ئامادە دەبێت و بابەتێك پێشکەش دەکات بە ناونیشانی (موحەممەدی گەورە) منیش جۆرێ لە بێتاقەتی دایگرتم، کاتێك پرسیم بۆچی نووسیوتانە گەورە؟ وتیان تەنها هەڵەیەکی چاپ بووە.

دوای نزیکەی دوو مانگ هەمدی بانگهێشت کرام بۆ وتەیەك لە یادی لەدایك بوونی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەمجارەیان لەلایەن کۆمەڵەی موسڵمانان بوو لە بریتۆیای پایتەختی کارگێڕی باشووری ئەفریقیا، دووبارە هەمان بابەتم دیاری کرد.

هەمدی واقم وڕما کە لە قۆستەرەکاندا هەمان بەزمی پێشوو دووبارە بووبوویەوە، هەمان بیانووش هێنرایەوە، هەردوو رووداوەکە لە باشووری

ئەفریقیای ولآتی خۆمدا روویاندا، جا با نموونەیەکی ترت بۆ باس بکەم سەبارەت بە گرێکوێرەی ئێمە کە بەشێکی گەورەی نەخۆشی ئوممەتەکەمان نیشان دەدات.

ویلایەتە یەکگرتووەکان جیاواز نیە؛

لە وتارێکم کە لە ساڵی 1977ز. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێشکەشم کرد، باسم لەوە کرد کە دوژمنانمان لە جیهانی نوێدا پێیان چەقیوەتە ناو قوڕ، لە ڕێی چەندین ئەزموونی تاڵەوە کە پێم وایە ئەم ئەزموونە بەس بێت بۆ سەلماندنی ئەو خاڵە.

موسڵمانانی ئەندیانابۆلیس پێشنیاریان کرد کۆڕێکم بۆ بگرن سەبارەت بە بابەتی (کتێبی پیرۆز سەبارەت بە موحەممەد (ﷺ) چی دەڵێت)، ڕازیش بوون بانگەشە بۆ خودی ئەو بابەتە بکەن، بەڵام خۆشەویستیان نەیهێشت ئەوە بکەن، چونکە بڕوایان وابوو بابەتەکە زۆر نامۆ بێت، بۆیە بە دانایی خۆیان ناونیشانەکەیان گۆڕی بۆ (پێغەمبەرێ لە کتێبی پیرۆزدا) ئەوەبوو بێ هیچ کێشەیەك بابەتەکە قبووڵ کرا، بۆ کەسێکی هیندۆسی یان موسڵمان یان مەسیحی یان جوولەکە دەکرێت هەڵخەڵەتێت و ئامادە بێت، بەلام ئەی وشەی (پێغەمبەر) یانی چی، لای زۆربەی خەڵك پێغەمبەر واتە هەر پێغەمبەرێ،

بۆیە بەشێکی حەزی ئامادەبوونەکە بۆ ئەوە بوو بزانن چ پێغەمبەرێکی ناو کتێبی پیرۆزە لە بابەتەکەدا باس دەکرێت؟ جۆب، جویل، یوونس، عەزرا، ئیلیشا، حیزقیال، ئەمانە تەنها چەند دانەیەکن کە لە کتێبی پیرۆزدا باسکراون، وەك پێشبینیم کردبوو خەڵکێکی زۆر ئامادە بوون.

### گرێی کەموکورتی:

هۆکاری ئەم نەخۆشیە چیە؟ ئەمە گرێی کەموکورتیە؟ بەڵێ، ئێمەی مرۆڤەکان دەستەوسانین، لەرووی دینامیکیەوە تواوینەتەوە، نەك تەنها لەرێی دوژمنەکانمانەوە، بەڵکو لەرێی دۆستە بێرۆحەکانمانەوە، ئێمە تەنانەت ناوێرین چاپەتومانی خوا بۆ پێغەمبەرەکەی دووبارە بکەینەوە ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ۝٤ ﴾ القلم: ٤

### کاریگەرترین:

خۆی هەروابووە کە هەر کەسێك تا ئاستێکی زۆر سەرکردەکەی خۆی خۆشدەوێت و بەرز رایدەگرێت، ئیتر سەرۆکی دەستەیەکی ئایینی بێت یان شەیتانێ بێ یان پێغەمبەرێ یان هەرچی بێ، ئێمەش زۆرجار وادەکەین.

جا ئەگەر من وتەی موسڵمانان بهێنم سەبارەت بە پێغەمبەر موحەممەد(ﷺ) ئەوە دەوترێت زێدەڕۆیی یان خەیاڵ یان بەخوادانانە، ئەم قسانەش لەلایەن ئەو دوژمنانەی ئیسلامەوە دەکرێت کە گومان دروست دەکەن، بۆیە وتەی کەسانێکی مێژوویی بێلایەن دێنم، تەنانەت وتەی دوژمنانی پێغەمبەر(ﷺ) دێنم کە راشکاوانە چییان وتووە، ئەگەر ستایش و دانپێدانانی ناموسڵمانانی ش کار نەکاتە سەر دڵت و لەسەر بیروباوەڕێکی هەڵەیت و جگە لە ئیسلامت هەڵبژاردووە، ئەوە چاك بزانە داری مردووی زۆر لە کەشتی ئیسلامدا هەن.

لە سەردەمی نوێدا لە ئەمریکا کتێبێ دەرچوو بەناونیشانی (سەد لووتکەکە) (گەورەترین سەد کەس لە مێژوودا)، مایکل هارت کە بە کەسێکی مێژوویی و تایبەتمەندی بواری بیرکاری و گەردووناسی ناسراوە، ئەو کتێبە نوێیەی نووسیوە، گەڕاوە بەناو مێژوودا و بەدوای کاریگەرترین کەسەکانی ناو مرۆڤایەتیدا گەڕاوە، لەو کتێبەیدا ناوی سەد کاریگەرترین کەسایەتیەکانمان بۆ دێنێت، لەنێویاندا ئەسۆکا و ئەرستۆ وبووزا و کۆنفۆشیۆس و هیتلەر و ئەفلاتوون هەن، تەنها نەخشەی سەد کاریگەرترین کەسایەتیەکانی ناو خەڵکی پێداوین، بەڵام بەپێی کاریگەریی و رێژەی کاریگەرییان لە ژمارە یەکەوە تا ژمارە سەد ریزبەندی کردون، هۆکاری ئەو ریزبەندیەشی پێداوین،

**ئەگەر رازی نەبین بەو ریزبەندیە، هیچ نەبێ ڕێز و دەستخۆشی خۆمان بۆ ئەو هەوڵ و سپاردەکاریەی ئەو پیاوە ناشارینەوە.**

**ئەوەی زۆر سەرسوڕهێنەرە ئەوەیە کە پێغەمبەر موحەممەدی (ﷺ) لە ژمارە یەکدا داناوە، یەکەمی ئەو سەد کەسە، بێ ئەوەی ئەو خۆی ئاگادار بێت دووپاتی فەرمایشتی خوای کردووەتەوە کە دەفەرموێت:**

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ ﴾ الأحزاب: ٢١

**عیسا پێغەمبەر ژمارە سێیە:**

هارت پێغەمبەری ئیسلامی بە **یەکەم کەس داناوە، ئەمەش موسڵمانانی** دڵخۆش کرد، بەڵام ناموسڵمانانی **تووشی سەرسوڕمان کرد بەتایبەت** جوولەکەو مەسیحیەکان **کە ئەوەیان بە سووکایەتیەك دەزانی، بۆچی عیسا** ژمارە **سێ و مووسا ژمارە چوار؟ ئەمە بۆ ئەوان زۆر سەخت بوو و پێیان قووت نەدەدرا، بەڵام هارت چی وت؟ ڕێ بدەن گوێ لە خۆی بگرین:(لەبەرئەوەی لە جیهاندا دوو هێندەی موسڵمانان مەسیحی هەن، لەرووی مەبدەئیەوە نامۆیە موحەممەد پلەیەکی بەرزتر لە عیسای هەبێت، بەڵام دوو هۆکاری سەرەکی هەن بۆ ئەو بڕیارە:**

**یەکەم: موحەممەد رۆڵێکی گرنگتری بینی لە گەشەسەندنی ئیسلامدا لەچاو رۆڵی عیسا لە گەشەسەندنی مەسیحیەتدا.**

**هەرچەندە عیسا بەرپرس بوو لە بنەما رەوشتیەکانی ئایینی مەسیحیەت(تا ئاستێ جیاواز بوو لە ئایینی جوولەکایەتی) بەڵام قەشە پۆڵس گەشەپێدەری بنەڕەتی زانستی لاهووتی مەسیحی بوو، بۆیە ئەو بووە بە سەرچاوەی بنەڕەتی و نووسەری بەشی گەورەی عەهدی جەدید، لەکاتێکدا موحەممەد (ﷺ) بەرپرس بوو لە هەموو زانستی یەکخواپەرستی ناو ئیسلام و بنەما سەرەکیە ئەخلاقیەکانی ئیسلام.**

**وێرای ئەوەی رۆڵی بنەرەتی بینی لە چەسپاندنی بیروباوەڕی نوێ و دامەزراندنی رێورەسمەکانی ئایینی ئیسلام.**[1]

---

[1] - مایکل هارت: ال 100، ص 38-39.

پۆلس دامەزرێنەری مەسیحیەتە:

بەپێی وتەکەی هارت گەورەیی دامەزراندنی مەسیحیەت لەنێوان عیسا و قەشە پۆڵسدا دابەش بووە، پێیشی وایە پۆڵس تاکە دامەزرێنەری مەسیحیەتە.

ناتوانم زۆر خۆبگرم لە شاردنەوەی هاوڕابوونم بۆ هارت، زیاد لە بیست و حەوت کتێبی عەهدی جەدید هەن کە زیاتر لە نیوەیان پۆڵس لێیان بەرپرسە، لە بەرامبەردا مامۆستا یەك وشەشی لەو بیست و حەوت کتێبە نەنووسیوە، ئەگەر توانیت دەست بخەیتە سەر (کتێبی پیرۆز بە پیتە سوورەکان) ئەوە بۆ هەر وشەیەك کە دەڵێت لەڕێی عیساوە وتراوە دەبینیت بە ڕەنگی سوور نووسراوەو ئەوی تر بە ڕەنگی ڕەشی ئاسایی، دواتر دەبینیت لەو ئینجیلەی دراوەتەوە پاڵ عیسا نەوەد لە سەدی ئەو بیست و حەوت کتێبەی عەهدی جەدید بە ڕەنگی ڕەش چاپکراوە.

ئەمە دانپێدانانێکی پوختی مەسیحیە بۆ ئینجیل، کاتێکیش موژدەبەرە مەسیحیەکان دەدوێنیت، دەبینیت سەد لە سەد قسەکانی پۆڵس بە بەڵگە دێننەوە.

کەس نیە شوێن عیسا کەوتبێ:

عیسا دەڵێت (ئەگەر منتان خۆش دەوێت ئەوە وەسیەتەکانم بپارێزن) (یووحەننا 14: 15).

هەروەها دەڵێت (هەرکەس یەکێك لەو وەسیەتە بچووکانەم هەڵبوەشێنێتەوەو خەڵکی ئاوا فێر بکات، ئەوە دواتر لە مەلەکووتی ئاسمانەکاندا بە بچووکترین بانگ دەکرێت) (مەتا 5: 19).

هەر مەسیحیەك کە حەزی کشتومڕو ناکۆکیەکان هەیە کە لێی دەپرسیت ئەرێ یاسا و وەسیەتەکان دەپارێزیت؟ خێرا وەڵامت دەداتەوە نا، ئەگەر بڵێیت بۆچی؟ ئەگەر زۆر شارەزای کتێبی پیرۆز نەبێت دەڵێت قانوون برایە سەر خاچ، واتە لەگەڵ عیسادا ئەوانیش لەخاچ دران و نەمان، ئێستا ئێمە لەژێر ڕەحمەتدا دەژین.

ئەگەر وتەی مەسیح و مامۆستاکەی(عیسا پێغەمبەر)ی بۆ بخوێنیتەوە ئەوە یەکێك لەمانە وەڵامت دەداتەوە(کورنش، ئەفسوس، فیلیبی...).

ەگەر بپرسیت ئەوانە کێن؟ خێرا دەڵێت پۆڵس پۆڵس پۆڵس، ئەی مامۆستاکەت کێیە؟ خێرا دەڵێت عیسایە، بەڵام هەمیشە پەیامی عیسا و پۆڵس دژ بەیەکن.

مەسیحیەکی رۆشنبیر نیە هاوڕای ئەوە نەبێت کە دامەزرێنەری حەقیقی مەسیحیەت قەشە پۆڵسە، بۆیە عارت نادادپەروەر نەبووە لە دانانی عیسا لە پلەی سێیەمدا.

## بۆچی بەشداربوانت تووڕە دەکایت؟

هارت کە مەسیحی لە پلە سێیەمدا دانا پرسیارێکی گرنگمان لا پەیدا بوو، ئەویش ئەوەیە بۆچی کەسێکی ئەمریکی کتێبێکی چەند سەد لاپەڕەیی لە ئەمریکا چاپ دەکات و بە بەهای پانزە دۆلار بۆ هەر نوسخەیەك دەیفرۆشێت، بۆچی لە رێ لانادات تا خوێنەرانی وڵاتەکەی بۆ لای خۆی رابکێشێت؟

کێ دواتر کتێبەکانی دەکرێت؟ ببە دڵنیاییەوە پاکستانی و بەنگلادشیەکان نین، یان تورکەکان نین، ئەوە ئەوانە چەند نوسخەیەکیان کڕی، زۆربەی بەشداربوانی دووسەد و پەنجا ملیۆن مەسیحی و شەش ملیۆن جوولەکەی ئەمریکین، ئیتر بۆچی ئەوانە تووڕە دەکات؟ مەگەر ئاگاداری ئەوە نیە؟ بەدڵنیاییەوە ئاگادارە، بەڵام بۆچی ئەم هەڵوێستەی نواند، پێش ئەوەی کۆتایی بە باسەکەی هارت بهێنم گوێ لە خۆی دەگرین بزانین چ پۆزشێکی هەیە:

من کە موحەممەدم(ﷺ) هەڵبژارد تا یەکەم ناوی کاریگەرترین کەسەکانی ناو جیهاندا بێت، لەوانەیە هەندێ خوێنەر تووشی شۆک بکات، لەوانەیە جێی پرسیاری هەندێکی تر بێت، بەڵام ئەو تاکە پیاوی ناو مێژوو بوو کە لە هەردوو بواری ئایینی و دنیاییشدا سەرکەوتنی زیاتری بەدەستهێنا.

گەورە سەرکردەکانی ناو مێژوو کێ بوون؟

گۆڤاری تایم کە گۆڤارێکی بەناوبانگی ئەمریکیە لە بەشی سەرەوەی بەرگی گۆڤارەکە ئەم ناونیشانەی لەخۆگرتبوو، لەناو گۆڤارەکەدا چەندین بابەت نووسرابوو لەژێر ناونیشانی (چی سەرکردەی گەورە دروست دەکات؟) (لەروانگەی مێژووییەوە کێ شیاوی ئەوەیە؟)، تایم پرسیاری کردبوو لە چەند کەسێتی مێژوویی و نووسەر و سەربازی و سەرمایەداران و کەسانی تر، هەرکەسەو کاندیدی خۆی بەپێی بابەتەکە خستبوویەڕوو و پشتی بەستبوو بە درك و مۆرکی خۆی.

## كێ د.سالا زار دەناسێت؟

من وا راهاتووم و هۆكارێكی بەختەوەریشم ئەوەیە كە كەسانی ناموسڵمان بەرم بۆ گەشتێكی گەورەترین مزگەوتی نیوەی باشووری زەوی لە درین كە مزگەوتی (الجمعه) یە، لە بۆنەیەكدا میوانداری ژن‌و مێردێكی پورتوگالیم كرد، لە قۆناغێكی مشتومڕ لەگەڵ كابرای پورتوگالیدا وتی د.سالا زار پیاوێكی گەورەی جیهان بوو، منیش هیچ قسەم لەسەر نەكرد، چونكە زانیاری كەمم هەبوو لەسەر دكتۆر سالا زار، لەبەرئەوەی دیكتاتۆری پورتوگال بوو و كەسێكی زۆر چاك نەبو بۆ گەلەكەی، بەڵام میوانە هەژارەكەم بەپێی زانست و دید و مۆركی خۆی قسەی دەكرد.

## ناكرێت بێئاگا بیت لە موحەممەد (ﷺ).

یەكێك لە بەشداربوانی گۆڤاری تایم وای نیشانداوە كە كەس نیە بتوانێت بێئاگا بێت لە موحەممەد.

ویلیام میكنل كە كەسێكی مێژوویی ئەمریكیە لە زانكۆی شیكاگۆ، ئەمەی نووسیبوو:

ئەگەر سەرکردایەتی بەپێی کاریگەری پێوانە بگرێت، ئەوە ناوی عیسا و بووزا و موحەممەد و کۆنفۆشیۆس و پێغەمبەرە گەورەکان لە گەورە سەرکردەکانی جیهانن.

میکنل وردەکاری زیاتری نەخستووەتە روو، ئینجا هیچی باس نەکردووە بۆچی عیسای لە یەکەمدا داناو موحەممەدی لە سێیەمدا دنانا، لەوانەیە لەبەر هێز یان نەریت بێت، لەوانەشە لەبەرئەوە بێت کە میکنل مەسیحیە، ئێمە مشتومڕی لەگەڵ ناکەین.

دواتر جیمس جیڤن دێت کە پیاوێکی ناو سوپای ئەمریکیەو خانەنشین کراوە، دەڵێت:

لەنێو ئەو سەرکردانەی لە مێژوودا گەورەترین کاریگەرییان دروست کردووە، من موحەممەد (ﷺ) و عیسای مەسیح و لەوانەشە لینین و دەشکرێت ماو پێشنیار بکەم، وەك سەرکردەیەك ئێستا بمانەوێت سیفەتەکانی بەکاربهێنین، ئەوا جۆن کەنەدی هەڵدەبژێرم، جیڤن شتێکی لەوە زیاتر نەوتووە، بەڵام پێویستە رێزی بگرین، ئەمە پێی دەوترێت چەسپاویەکی گەورە، ئەو ناوی موحەممەدی پێش مەسیح دانا، دڵنیاشم ئەوەی هەرلەخۆوەو بێ مەبەست نەکردووە.

جۆلز ماسرمان کە توێژەرێکی دەروونی ئەمریکی و مامۆستای زانکۆی شیکاگۆیە، جیاواز لەوانی تر بەشداری کردووەو یاسای جیاوازی هەیە، هۆکاری هەڵبژاردنی گەورەترین سەرکردەی لە هەر سەردەمێکدا پێ داوین، ئەو لە ئێمەی دەوێت بزانین چیمان مەبەستە لەو کەسایەتیە، سیفەتەکانی وایانلێکرووە جیاواز بێت، یان لەوانەیە بۆ بڕێ سیفەتی بگەڕێین، هەمان شێوەی هارت بۆ کەسێك دەگەڕێت کە گەورەترین هێزی کاریگەری هەبوویێت، بەڵام ماسرمان نایەوێت لەسەر خەیاڵ و مۆرکی خۆمان کار بکەین، بەڵکو دەیەوێ بڕێك پێوەری مەوزووعیمان هەبن بۆ بڕیاردان پێش ئەوەی گەورەییەکە بدەین بە هیچ کەسێك، بۆیە دەڵێت: پێویستە سەرکردەکان سێ سیفەت بەدیبهێنن:

یەکەم: پێویستە سەرکردە بەختەوەری ببەخشێت.. سەرکردە هەرکەس بێت دەبێت چاکەی بۆ ئێوە بوێت، بۆیە نابێت وەك قەشە جیم جۆنز تاون جویانای خاوەنی (پەرستشی خۆکوشتن) ناوبانگ خراپ بێت، دواتریش وەك کەسێك باسی بکرێت کە لەگەڵ نۆسەد و دە کەس لە شوێنکەوتەکانی لە یەك کاتدا هەموو پێکەوە خۆیان کوشت.

حکوومەتی ویلایەتە یەککگرتووەکان ئاگاداری هەوڵەکەی ئەو بوو و خەریك بوو لەسەر تاوانە چەندبارەکانی دەستگیر بکرێت، بەڵام پێش ئەوەی بتوانن بیگرن، بیری کردەوە لەوەی خۆی و شوێنکەوتەکان رزگار بکات،

نیتر کەس نابێت لە دژی شایەتی بدات، بۆیە گیراوەی لیمۆی تێکەڵ بە ژەهر کرد و ئامۆژگاری هەوادارانی خۆی کرد بیخۆنەوە، هەموویان خواردیانەوەو هەموویان بەو سەرشۆڕیە مردن، لەو کاتەدا دەرکەوت قەشە جیم جۆنز پانزە ملیۆن دۆلاری دەستکەوتووەو لە چەند بانکێکی جیهاندا لە ژمارە بانکی خۆیدا دایناوە، هەموو قوربانیەکانی بووبوون بە مانگای شیردەر بۆی و ەویش بۆ تێرکردنی ئارەزوو و تەماعی خۆی ئەوانی بەکاردەهێنا.

دووەم: دەبێت سەرکردە یان ئەوەی بڕیارە ببێتە سەرکردە کۆمەڵگەیەکی ڕێکخراو بەهەم بهێنێ کە تیایدا خەڵك هەست بکەن بە ئارامیو ئاسایشێکی ڕێژەیی.

پێچەوانەی مارکسی و فاشیو نازی و نازیە نوێکان و ئیشکینازی و صەهیۆنی و هاوشێوەکانیان، پرۆفیسۆر ماسرمان لە نووسینە کورتەکەی خۆی لە گۆڤاری تایمدا ئەوەی پشتگوێ نەخستووە، بەڵکو بڕواو هەستی زۆر روونە بۆ گەڕان بەدوای سەرکردەیەکدا کە کۆمەڵگەیەکی دوور لە خودپەرستی و چاوچنۆکی و دەمارگیری بەدیبهێنێ، چونکە هەموو ئەو ڕێرەوانەی تر تۆوی وێرانکاری ناوخۆییان لە ناخدا هەڵگرتووە.

(هێشتا خەفەت و تاوان و ستەم و چەوساندنەوەو هەڵەو رقلێبوونێکی زۆر هەیە، هێشتا خۆبەزلزانی ویژدان دەمرێنێ و ململانێ ڕۆحمان دەکێشێ و سۆز ناهێڵێ و گۆشتێکی بێزراو و تەمومژێکی لەناوبەر دروست دەکات، وا

نیشان دەدات بت شیاوی پەرستن بێ، هێشتا رەشەبای نەفامی سەخت فوو دەکات بە کەرەنایەکی گەورەدا و هەوڵ دەدات دانایی حەق شەرمەزار کبات، هێشتا خەڵکی کۆیلەین هەیەو بە شانازیشەوە وا نیشان دەدەن کۆیلایەتی نەماوە، هێشتا زبری و توندوتیژی کرۆکی مەسەلەکانی قووتداوە، بەڵکو زیاتر لەمەو لەوەش..ز دەنگی تاکەکە بە هاشوهووشی کۆمەڵەو دەستەیەك خامۆش دەکرێکە هاوار شێتی دەکەن، ئیتر بانگەواز بۆ جەنگی نوێ ناو بنێین چی... هەموو درۆکان دووریان گرتووە...) (عەبدوڵا یووسف عەلی).

سێیەم: پێویستە سەرکردە یەك دەستە بیروباوەڕ ببەخشێت بە گەلەکەی، ئاسانە لەبیروباوەڕ و مرۆڤایەتیدا باسی برایەتی بکەیت، بەڵام لە باشووری ئەفریقی ئەمڕۆدا نزیکەی مەزار دەستەو تاقمی جیاواز لەنێو سپی پێستەکاندا(بەرەچەڵەك ئەورووپی) هەن، سێ هەزاریش لە نێو رەشپێستە بەرەچەڵەك ئەفریقیەکاندا هەن.

کڵێسە سپی پێستەکانی وڵاتەکەم ئوسقوفە رەشپێستەکان دەردەکەن، بەڵام هەر لە سەرەتای سێ سەد ساڵی داگیرکاری ئەورووپیەوە رەشپێستەکان یەك قەشەیان دەرنەکردبوو، تا ئێستاش رەشپێست و سپی پێست و رەنگاورەنگو هیندیەکان ناتوانن لە کڵێسای هۆڵەندی نوێدا پێکەوە نوێژ بکەن، کینەو رقی نێوان دەستە مەسیحیەکان بە روونی لەلایەن ئیمپراتۆر جوولیانەوە باسکراوە کە دەڵێت: ئاژەڵەکەانیش ئەو دەروونە

دوژمنکاریەیان بەرامبەر بە مرۆڤ نیە وەك ئەوەی تاقمە مەسیحیەکان بە گشتی دژ بە یەکدی هەیانە.[1]

لە روانگەی ئەم سێ پێوەرەی پێشووەوە باسرمان بەناو مێژوودا گەڕاوەو شرۆڤەی ژیانی کەسایەتیەکانی لویس پاستەر و سولك و گاندی و کۆنفۆشیۆس و قەیصەر و هیتلەر و بووزا و عیسا و چەندێکی تری کردووە، دواجار گەیشتە ئەو ئەنجامەی:

لەوانەیە گەورەترین سەرکردەی هەموو سەردەمەکان موحەممەد(ﷺ) بێت کە هەر سێ سیفەتەکەی هەبوو، بەشێوەیەکی کەمتر لەویش مووسا هەمان شتی کردووە.

سەرمان سوڕدەمێنێ لە مارسمانێکی جوولەکە کە توێژینەوە لەسەر ئەدۆلف هیتلەی دوژمنی سەرەکی گەلەکەی بکات و هیتلەر بخاتە بە باسی ئەوە ئایا سەرکردەیەکی گەورەیە، گەلەکەی کە گەلی گەورەی ئەڵمانی نەوەد ملیۆن کەسیە، ئامادەی ئەوەبوو بە فەرمانی ئەو هەستێ و دانیشێ، بەڵام بەداخەوە گەلەکەی بەرەو وێرانکاری برد.

هیتلەی پرسیارەکە نیە، بەڵکو دەپرسین بۆچی ماسرمانی جوولەکەی ئەمریکی خزمەتکاری حکوومەت کە مووچەی لە حکوومەتەوە وەردەگرت، بۆ

[1] - سعيد أمين علي: روح الاسلام، ص 1.

لەبەردەم گەلە دووسەد ملیۆنیە جوولەکەو مەسیحیەکەی دەڵێت نە عیسا و نە مووسا، بەڵکو موحەممەد سەرکردەی گەورەی هەموو سەردەمەکانە، خۆت لێی ورد بەرەوە.

## گۆبانسازان چی دەڵێن؟

مایکل هارت لە لیستی سەد کەسەکە موحەممەدی خستە ژمارە یەك و عیسای مامۆستاو رزگارکەری خۆی خستە ژمارە سێ.

ویلیام مکنیل موحەممەدی بە شیاوتر زانی تا لە لیستەکەدا دایبنێت و لە یەکەمی ئەو سێ یەکەم کەسەدا دایبنێت

بۆچی؟ ئایا ئەمە بە بەرتیل کرا؟

جیمس جیڤن موحەممەدی (ﷺ) پێش عیسا پێغەمبەر دانا،

بۆچی؟ ئایا ئەمە بە بەرتیل کرا؟

یولیوس ماسرمان بریاری دا موحەممەد (ﷺ) ژمارە یەك بێت و مووسای پاڵەوانی لە –پلەی دووەمدا دانا،

بۆچی؟ ئایا ئەمە بە بەرتیل کرا؟

ئەکرێت بڵێین هەر هەنگاوێکی پیامەڵدانی موحەممەد(ﷺ) هەنگاوێکی سەرشۆڕی ملکەچ بە فێڵ فیکریە، بەرای من و لای منەوە، ناتوانم ئەگەرێکی وا دابنێم، بەراستی ئەگەر فێڵ و تەڵەکە هێندە بە خێرایی و بەهێزی لە جیهاندا گەشە بکات و سەربکەوێت، ئەوە کەسێکی تەواو شکستخواردوو دەبێت لەبەرئەوەی وا بیری کردووەتەوە لەو حەقەی کە مافی هەموو مرۆڤایەتیە.

هێشتا گاڵتەجارانێك هەن دەم دەکەنەوە لە هەر کەسێك کە هەر شتێکی باش سەبارەت بە موحەممەد (ﷺ) یان ئیسلام بڵێت و دەڵێن ئەوە بەرتیلی لە عەرەب وەرگرتووە، من دەیڵێمەوە دەگونجێت، بەڵام ئەگەرێکی دوورو لاوازە، لە ماوەی جەنگی جیهانی دووەمدا سوید تەنها یەك بەکرێگیراوی دۆزیەوە، بەڵام حوکمی ناپاکی لەسەر دراو لەسێدارە درا، ئێستا چۆن دەبێت ئەمریکا و جیهانی ڕۆژئاوایی گەیشتبنە ئەم قۆناغی پێگەیشتنە، کەچی برێ بەکرێگیراو بەرهەم بهێنن تا بە دۆلاری نەوتی ناو ڕۆژهەڵات پێشیان بخاتە، تکایە سپاردەکاریو دلێری پیاوانێ مەخەرە ژێر پرسیار، ئەوانەی بێ هیچ ترس و بەرژەوەندیەك لێنەویون و باکیان لە عەیبەی تۆمەت نەبووە، دە پێویستە هەموومان ڕێزیان بگرین.

دەکرێت ئێستا بگەینە ئەو ئەنجامەی موحەممەد (ﷺ) رەحمەتی خوا بووەو خواش هەمیشە زانایە کێ نیەتی پاکە لە خزمەتی دیندا، بۆیە خوا بەڵێنی خۆی بۆ موحەممەدی پێغەمبەری بردە سەر:

﴿ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ۝٤ ﴾ الشرح: ٤

ئەمە سێ واتای لەخۆگرتووە:

یەکەم: ئایا ناوبانگی تۆمان بەرز راگرتووە؟

دووەم: ئایا ناوی تۆمان بەرز راگرتووە؟

سێیەم: ئایا ناوو ناوبانگی باڵا و ناوازەمان پێ بەخشیویت؟

دۆست و دوژمن وەك بڵێی فشارێکی شاراوە هەبێت وای لێکردون بێ ئەوەی کەس داوایان لێ بکات وەسفو سەنای پێغەمبەر(ﷺ) بکەن، بەڵام خوای گەورە تەنانەت شەیتانیش دەخاتەکار بۆ خزمەتی وەك چۆن لە سەردەمی عیسا پێغەمبەردا ئەوەی کرد (مەتا 4: 1-11) تەنانەت هەندێ جار شەیتانیش راستیەکانی ئینجیل دەڵێت.

پرۆفیسۆر راماکرشنا کە فەیلەسووفێکی هیندۆسیە لە کتێبەکەیدا (موحەممەد پێغەمبەری ئیسلام) بەڵگە بە شەیتانی گەورە دێنێتەوە، خۆی،

بەڵێ، ئەویش ئەدۆلف هیتلەرە، دەیەوێت لەو رێگەوە گەورەیی ناوازەی موحەممەد (ﷺ) بسەلمێنێت.

پرۆفیسۆرێکی وەك جۆلز ماسرمان پێغەمبەری ئیسلامی لەسەر سێ بنەما پێوانە کردووە، ئەو کالا گرانبەهایەی لە پاڵەوانەکەماندا بەدیکردووە جێی مشتومڕەو وتەی هیتلەری بە بەڵگە هێناوەتەوە کە دەڵێت( دانەری بیردۆزە گەورەکان دەگمەنە سەرکردەیەکی گەورە بێت، تا ئاستێکی زۆریش بانگخواز هەر وایە، بە پیاوەتیەکی زیاتر دەبێت سێ سیفەتی هەبێت، هەمیشە ئەوە سەرکردەی چاکتر دەبێت، سەرکردایەتی واتە توانای جووڵاندنی کوتلەی پیاوان، بەهرەی بەرهەمهێنانی بیرۆکە شتێکی گشتی نیە لەگەڵ هێزی سەرکردایەتیدا) هەروەها هیتلەر دەڵێت (دانەری بیردۆزە و رێکخەر و سەرکردە لە یەك کەسدا کۆبێـەوە ئەوە دیاردەیەکی دەگمەنە لە سەر زەویدا، لەو کاتەدا گەورەیی دێـتەدی)، پرۆفیسۆر لەمەوە قسەی خۆی دەکات و دەڵێت (پێغەمبەری ئیسلام مەشخەڵە دیارە دەگمەنەکانی سەر زەوی بەدی کرد و بە خوێن و گۆشتەوە رێی دەبڕی).

پێش ئەوەی هەر کەسێك هێرش بکاتە سەر پرۆفیسۆر وارتشانە لەبەرئەوەی بێلایەن بووە، رێ بدەن چەند ناوێکتان پێ بڵێم کە سەرسام بون بە موحەممەد (ﷺ):

یەکەم: موحەممەد گیانی خۆشەویستی و میهرەبانی بوو، کاریگەریەکی زۆری بەجێهێشت و ئەوانەی لە دەوری بوون هەرگیز لەبیریان نەکرد.(زانای هیندۆسی دیوان شاند شارما لە کتێبەکەیدا پێغەمبەرانی رۆژهەلات، ص 122).

دووەم: دوای چەند سالێ لە مەرگی جوستنیان لە سالی 569ز. لە مەککە لە نیمچە دوورگەی عەرەبی ئەو پیاوە لەدایکبوو کە لەنێو هەموو پیاواندا دەرکەوت تا بوویە کاریگەرترین کەسی ناو وەچەی مرۆڤایەتی...ئەویش موحەممەد (ﷺ) بوو. (جۆن ویلیام درابەر لە کتێبەکەیدا (مێژووی پەرەسەندنی هزری لە ئەوروپا) لەندەن 1985ز.).

سێیەم: گومانم هەیە ئەگەر هەر کەسێ بارودۆخی وا زۆر گۆڕاوی وەك موحەممەد هەبوایە، ئەوا لەبری بەرنگاربوونەوەی خۆی دەگۆڕا. (بۆدلی لە کتێبەکەیدا–پێغەمبەر– لەندەن 1946 ص 9).

چوارەم: من خوێندنەوەم لەسەر کردووە...پیاوێکی ناوازە... بەرای من هەرچەندە دژ بە مەسیح بووە چێویستە بە دڵسۆز و رزگارکەری مرۆڤایەتی ناو ببرێت. (جۆرج برنارد شۆ لە کتێبەکەیدا ئیسلامی راستەقینە، بەرگی یەکەم، ژمارە 81936).

پێنجەم: قەدەر وابوو زۆر ناوازە بوو لە پارێزکاریدا، موحەممەد (ﷺ) دامەزرێنەری سێ مەسەلە بوو: ئوممەت و ئیمپراتۆریەت و ئایین. (بوسورس سمیس لە کتێبەکەیدا –موحەممەد و موحەممەدی بوون–).

شەشەم: موحەممەد لەنێو هەموو کەسایەتیە ئایینیەکاندا سەرکەوتووترین بوو. (ئینسکلۆپیدیای بەریتانی، چاپی یانزەهەم).

## باسی دووەم: لە مێژووی رابردووەوە:

سەخت نیە هەمدی ناوی کەسانێکی تر بێنین کە رێزیان گرتووە لە پێغەمبەر(ﷺ) یان رەخنەیان لێی هەبووە، وێرای مەوزووعی بوون و عەقلیان، هەندێ جار دەکرێ مەبەستیان ناوبانگ بەدەستهێنان بێت، خوێنەرانی ئازیزم رێ بدەن بگەرێمەوە بۆ رابردوو، لە هەینی هەشتی مایۆی سالی 1840 ز.دا واتە نزیکەی سەد و پەنجا سالێ لەمەوبەر، لە سەردەمێکدا کە پیرۆزیەکان پیس کران و بە ناشیرین دادەنران شتێکی جوان سەبارەت بە موحەممەد (ﷺ) بلێیت، مەسیحیەکانی رۆژئاوا راهاتبوون بە رقبوون لە موحەممەد و دینەکەشی، لەسەر ئەوەش خەلکیان رادەهێنا، وەك چۆن لەسەر سەکۆیەکی شارەکەی من سەگەکان رادێنن لەسەر رقبوون لە مرۆڤی رەشپێست، لەو کات و مێژووەدا، تۆماس کارلایل کە یەکێك بوو لە گەورە بیریارانی سەدەی پێشوو، زنجیرەیەك وتاری پێشکەش کرد لەژێر ناونیشانی (پالەوانان و پالەوانێکی بەرزراگر).

کارلایل ئەو مۆرکە کوێرانەی گەلەکەی خۆی هەر لە سەرەتای وتەکانیەوە خستەڕوو، گەڕایەوە لای یەکێك لە ئەدیبە گەورەکان کە زانایەکی هۆلەندی و پیاوێکی دەولەت بوو کە ناسراوە بە گۆگرۆشیۆس کە سەرکۆنەیەکی زۆر و توندی دژ بە پێغەمبەری ئیسلام نووسیبوو و پێغەمبەری خوای(ﷺ) تۆمەتبار دەکرد بەوەی بتپەرستانی راهێناوە تا دانەوێلە لە

گوڵه‌که‌ی بکه‌نه‌وه، هه‌روه‌ها توانی گه‌له‌که‌ی له‌خشته‌ ببات به‌وه‌ی بڵێت من ڕۆحولقودسم و له‌ شێوه‌ی کۆترێکدا سروشی خوایی بۆ دێت، دوای ئه‌وه‌ له‌ کتێبه‌ پیرۆزه‌که‌یاندا که‌ قورئانه‌ ئه‌وه‌یان تۆمار کرد، له‌وانه‌یه‌ گۆگرۆشیۆس کاریگه‌ر بووبێت به‌و چیرۆکه‌ خه‌یاڵیه‌ی که‌ له‌ کتێبه‌ پیرۆزه‌کانی خۆیدا هاتووه‌(ئه‌کات عیسا ته‌عمید کرا-له‌ڕێی یووحه‌ننای موعه‌مدان له‌ ڕووباری ئه‌رده‌ن- ڕاسته‌وخۆ له‌ ئاوه‌وه‌ هات و ته‌ماشای کرد، ئاسمانی بۆ کرایه‌وه‌و بینی ڕۆحی خوا داده‌به‌زێت وه‌ك کۆترێك و له‌ سه‌ررووییه‌وه‌ نیشته‌وه‌) (مه‌تا 3: 16).

## ده‌سه‌لات له‌کوێیه؟

بوکرك که‌ بیریارێکی دیاری ئه‌م سه‌رده‌مه‌یه‌ وه‌ك گومانساز تۆما(یووحه‌ننا 20: 25) ویستی به‌ڵگه‌یه‌کی پیّ بێت بۆ مه‌سه‌له‌ی موحه‌ممه‌د و کۆتر و دانه‌وێڵه، به‌ڵام وه‌ڵامی بۆ گرۆشیۆس ئه‌وه‌بوو که‌ هیچ به‌ڵگه‌یه‌ك نیه.

ته‌نها هه‌ستی به‌وه‌ کرد که‌ ئه‌و چیرۆکه‌ی بۆ جه‌ماوه‌ره‌که‌ی داهێناوه، بۆ ئه‌و و جه‌ماوه‌ر بیردۆزه‌ی (کۆتر و دانه‌وێڵه) دڵخۆشکه‌رتر بوو له‌وه‌ی گه‌وره‌ی فریشته‌کان وشه‌کان بڵێته‌وه‌ به‌ موحه‌ممه‌د، ئه‌و وشانه‌ دڵی کارلایلیان گوشی:

(ئەو درۆیەی واتای دەمارگیری و دۆرسازیە لەسەر ئەو پیاوە، تەنها سەرشۆڕیە بۆمان).

## پێغەمبەری پاڵەوان:

کارلایل کەسێکی هەڵکەوتە بوو و خوای گەورە هونەری وتار پێشکەشکردنی پێ بەخشیبوو، ئەو ویستی بەو ڕێوشوێنەی خۆی ڕاستیەکان بخاتەوە شوێنی خۆیان، بۆیە پلانی دانا بۆ پێشکەشکردنی وانەیەك و بابەتێکی هەستیاری هەڵبژارد (پێغەمبەری پاڵەوان) پێغەمبەرە پاڵەوانەکەی خۆی هەڵبژارد تا ببێتە بەناوبانگترین کەسی سەردەمی خۆی، موحەممەد نەك مووسا یان یووسف یان سولەیمان یان عیسا، بەڵکو موحەممەد، بۆ ڕازیکردنی هێزی پێشووی ئینگلیکانی کە جوولەکە هەواداری بوون و سەر بە کڵێسای ئەنگلیکانی بوو و نزیکان و خەڵکانی وڵاتەکەی خۆی بوون، ئەم پۆزشەی هێنایەوە:

هەروەك لەلایەن موحەممەدیەکانەوە هیچ مەترسیەك نیە لەسەر هیچ کام لە ئێمە، بۆیە نیەتمە تا دەتوانم دادپەروەرانە هەموو شتێکی باش بڵێم.

وێڕای جەماوەرە زۆرەکەی، ئەو بێخەم بوو لە ترسی موسڵمانبوونی، دەیتوانی دەرفەت بقۆزێتەوە تا هەندێ وەسفی موحەممەد بخاتەڕوو، ئەگەر

ترسی هەبوایە لە گۆڕانی هێزی بیروباوەڕیان ئەوە ئەو دەرفەتەی نەدەقۆستەوە.

لە سەردەمی رق و کینە بەرامبەر بە هەر شتێکی موسڵمان، لەناو جەماوەرێکی دڵ پڕ لە گومان و گاڵتەجاڕی، کارلایل چەندین راستی گرنگی سەبارەت بە موحەممەد (ﷺ) خستەڕوو، بەراستی شیاوی سەناو پیاهەڵدانە، چەندین جار کالایل برێ دەستەواژەو دەربڕینی بەکاردەهێنا کە لەوانەیە موسڵمانانی باوەڕدار پێیان خۆش نەبوایە، بەڵام کەسە جێی لێخۆشبوونە لەەرئەوەی لەسەر پەتێکی ژیاری وەك پەتی جوولەکە رێ دەبڕێ، زۆر چاك سەرکەوتوو بوو سەنایەکی بەگوڕ و تینی سەبارەت بە پێغەمبەرمان خستەڕوو و چەندین درۆو تۆمەتی تێکشکاند کە دوژمنانی پێغەمبەر (ﷺ) دروستیان کردبوون، بە تەواوەتی وەك ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بەرامبەر بە عیسا پێغەمبەر کردی.

دڵسۆزی و نیازپاکییەکەی:

نیازپاکی کەسی گەورە لەو جۆرەیە کە ناکرێت قسەی تێدا بکرێت، نەك تەنها ئەوە، بەڵکو بڕوام وایە هەرگیز ناگونجێت هەستی دووڕوویی هەبووبێت، چۆن کەسێك ماوەی یەك ڕۆژ بە وردی لەسەر یاسای حەق بڕوات دووڕوویی هەبێت؟

نا، کەسی گەورە شانازی بە نیازپاکی خۆیەوە ناکات، دوورتر لەوەش، پرسیار لە خۆی ناکات ئایا وایە یان نا، ئیتر ئەوەی شیاوە بیڵێم ئەو کەسێکی نیازپاك بوو و تەنها نیازپاکیشی لێ دەوەشێتەوە. (پاڵەوانان و پاڵەوانێکی بەرزراگر، ص 59).

گیانێکی گەورەی خەباتکاری دڵسۆزو ڕزگارکەر، لەکاتێکدا خەڵکی دی لەپشت بانگەشەکانەوە ڕێیان دەکرد، بەڵام ئەو پیاوە خۆی نەخستە مۆرکێکی دیاریکراوەوە، ڕۆحیەتێکی دەگمەنی هەبوو و واقعیەتی لە کارەکاندا هەبوو... وەك وتمان ئەو دڵسۆز بوو، حەقیقەتێکی کرداری خوایی بوو، وشەیەك وەسفی ئەو پیاوە بکات ئەوەیە کە دەنگێکی ڕاستەوخۆی سروشتی دڵ بوو، پێویستە پیاوان گوێ لەو بگرن نەك لە هیچی تر... هەموو شتەکانی دی وەك بایەك وان کە ئەگەر بەراورد بکرێن بەو.[1]

---

[1] - پاڵەوانان و پاڵەوانێکی بەرزراگر، ص 71.

لەو هەموو وتانەیدا کارلایل ئاماژەی بە هیچ سەرچاوەیەك نەداوە بۆ جەماوەرەکەی، بەڵام من دەتوانم تەنها یەك رووداوی ناو ژیانی پێغەمبەرتان(ﷺ) بۆ بخەمەڕوو کە ئەوپەڕی دڵسۆزی ئەو نیشان دەدات لە تۆماری سروشی خواییدا کە قورئانی پیرۆزە.

رۆژانی یەکەمی پێغەمبەرایەتی لە مەککە بوو، موحەممەد (ﷺ) زۆر بە قووڵی رۆچووبوو لە هەوڵی بانگهێشتی رێبەرە بێباوەرەکانی قورەیش بەرەو ئیسلام، کاتێك یەکێك لەوانە دەهات، پێغەمبەر(ﷺ) بە وردیو گرنگیەکی زۆرەوە قسەی بۆ دەکرد، لەو کاتەدا کابرایەکی هەژاری نابینا هات کە پێی دەوترا عەبدوڵای کوڕی ئوم مەکتووم تا بچێتە ناو مشتومڕەکەو دەیویست گرنگی بەویش بدرێت، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) هیچ نەفەرموو، بەڵام بیری کردەوەو بەخۆی وت بۆچی کەمێك خۆت راناگریت، نابینیت لەبەر بێ تەحەمولی تۆ لەوانەیە ئەو بانگهێشتکراوانە لەدەست بچن، پێی وابوو خەڵکی کەم بەها و تاوانباریش شتی وا ناپرسن و زمانیان شتی وا ناڵێت، بەڵام ئەمە بۆ موحەممەد (ﷺ) نا، خوا هەڵیبژاردووە تا تایبەت بێت بەو چین و توێژە بەرزو دەوڵەمەندە، خوا دەفەرموێت﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ القلم: ٤

لەنێوەندی گفتگۆی لەگەڵ بێباوەڕانی ناو هۆزەکەیدا بوو کە خوای گەورە جیبریلی فریشتەی سروشی نارد تا ئەم سەرکۆنەیە بکەیەنێ:

﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ۝٢ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ۝٣ أَوۡ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكۡرَىٰٓ ۝٤ ﴾ عبس: ١ - ٤

پێغەمبەر(ﷺ) پێی ناخۆش بوو گفتگۆکە ببڕێت، لەوانەشە هەستی ئەو پیاوە هەژارەی بریندار کردبێت، بەڵام دڵێکی نەرمو میهرەبانی هەبوو و هەمیشە لەگەڵ هەژاراندا میهرەبان بوو، ڕووناکیەکی لە پەروەردگارەوە وەرگرتبوو، بێ هیچ دوودڵیەك خوا ئەو ڕووناکیەی نیشاندا تا هەتاهەتایە بمێنێتەوە.

ئیتر دوای ئەوە هەرکات پێغەمبەر (ﷺ) دەگەیشت بە کابرای نابیان، بە نەرمونیانی دەیدواند و سوپاسی دەکرد لەسەر ئەوەی ئەو هۆکار بوو تا خوا بێداری بکاتەوە، لەو ماوەش پێغەمبەر (ﷺ) لە مەدینە نەبوایە کابرای نابینای دەکردە فەرمانرەوای مەدینە، ئەمەش دوو جار ڕوویدا، دەی ئەوەی دڵسۆزی و عیرفانیێ کە وایکرد کارلایل وا باسی پێغەمبەر (ﷺ) بکات.

سپاردەکاریەکەی:

سپاردەکەی سنووردار نەبوو... هەرگیز خەدیجەی لەبیر نەدەچوویەوە. ماوەیەکی زۆر دوای مردنی خەدیجە، عائیشەی هاوسەری بچووکی، ئەو ئافرەتەی کە بە رەوشت و سیفەتە جوانەکانی نموونەی نێو موسڵمانان بوو. عائیشەی زیرەك رۆژێ پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد: ئایا من لە خەدیجە باشتر نیم؟ ئەو ئافرەتێکی بێوەژنی بەتەمەن بوو کە جوانی لەدەست دابوو. ئایا منت لەو زیاتر خۆش دەوێت؟... پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامی دایەوە نەبەخوا، نەبخوا، کاتێك خەڵکی بڕوایان پێ نەدەکردم –خەدیجە– باوەڕی پێ هێنام، لە ژیاندا تەنها یەك هاوڕێم هەبوو کە ئەویش خەدیجە بوو.[1]

ئاسانە فێڵی شەیتان بۆ خۆبەدەستەوەدان بۆ هاوسەرێکی بچووك و خۆشەویست و زیرەك و جوانی وەك عائیشەی راستگۆ بەرپەرچ بدرێتەوە، بۆچی بە برێ وشەی بریق و باق وەڵامی نەدایەوە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئازاری هیچ کەسی نەدەدا، تەنانەت ئازاری رۆحی خەدیجەشی نەدەدا، خەدیجەی دایکی دڵسۆز، سیفەتی لەو جۆرە پەیوەستی پێغەمبەرە(ﷺ) کە پیاوی هەڵکەوتەو برایەك بۆ هەموان‌و نیشاندانی جوانیەکان لە ماوەی چواردە سەدەدا دەخاتەڕوو ... بەراستی کورشی راستەقینەی دایکێکی ئاسایی بوو.

[1] - پاڵەوانان و پاڵەوانێکی بەرزراگر، ص 76.

دەستپاك و سپاردەكار:

پیاوی حەق و دڵسۆزی، ڕاستگۆ لە كدا و گوفتارو بیروباوەڕیدا، هەمیشە بە مەبەست گوفتار و كرداری هەبوو، زۆرجار بێدەنگ بوو و كەم قسەی دەكرد، كاتێك قسەیەكی نەبوایە بیكات بێدەنگ دەبوو، بەڵام دڵنیا و دانا و دڵسۆز بوو لە قسەكردنیدا، هەمیشە شارەزایی هەبوو بە بابەتەكان، ئیتر ئەو بێدەنگیەی وەك قسەكردن وابوو.[1]

ئاساییە كە موحەممەد(ﷺ) سووكایەتیەكی ئاراستەی قورەیشیە كەعبە پارێزە بتپارێزەكان بكردایە، یەك دوو كەسی كاریگەربوویش دوای بكەوتنایەو هێدی هێدی شتەكە بڵاو ببوایەتەوە، هەر بڵاویش دەبوویەوە، ئاساییش بوو سووكایەتی بە هەر تاكێكیان بكردایە.

پێغەمبەر(ﷺ) كەسێكی ماستاوچی نەبوو، بەڵكو پێویستی بكردایە زۆر ڕاشكاوانە قسەی دەكرد، كەسێكی زۆر ورد بوو، غەزای تەبووك نموونەیەكی وایە، زۆرێك لە هاوەڵانی ئامادەی چوون نەبوون، ئەی چۆن لەو كاتە سەختو گەرمەدا بڕۆن و بدەنە بەر ئەو گەرمایەو بەرووبووم جێبهێڵن، ئەمە هەرگیز لە یادەوەریشدا نەدەسڕایەوە، ئەگەر ئەوە كاتی چنینەوەی بەرووبوومی تۆ بوایە؟ ماوەی یەك ڕۆژ بمایەتەوە، ئینجا وەرە بەرهەمی یەك

[1] - پاڵەوانان و پاڵەوانێكی بەرزراگر، ص 69.

ساڵی رەبەق؟ لەو کاتەدا گەرمەدا، بەڵێ گەرم بو، بەڵام ئاگری دۆزەخ گەرمترە، هەندێ جار ئەوپەڕی گاڵتەجاری دێتەرێمان و بە ناموسڵمانان دەوترێت لە داهاتوودا هیچ کێشێکتان نابێت.[1]

تۆماس کارلایل زیاتر ئەو وشانەی هێناوە تا راچڵەکینێ بێت بۆ جەماوەرە مەسیحیەکەی ئینگلتەرای، ئەمەش پێش سەد ساڵ، مێژوو مشتومڕە زیندووەکانی ئەوی بۆ تۆمار نەکردوین، بەڵام بەڵێنی خۆی بردەسەر (مەبەستمە هێندەی بتوانم دادپەروەرانە هەموو شتێکی چاك لەبارەوە بڵێم-واتە پێغەمبەر موحەممەد(ﷺ)-) لە کۆڕەکانیدا بەرگری دەکرد لە پێغەمبەر(ﷺ) دژ بەو تۆمەت و ساختەکاریو ناوبانگ زڕاندنانەی کە دوژمنانی پێغەمبەر (ﷺ) پەیڕەویان دەکرد.

## تۆمەتی درۆزنی

ئایا کەسی درۆزن ئایینی پێ دادەمەزرێت؟ نا، کەسی درۆزن ناتوانێت لە یەك خشت ماڵێچك دروست بکات، ئەگەر شارەزا نەبێت و رێگە دروستەکان نەگرێتە بەر و قوڕەکە نەبرژێنیچ و کار نەکات، هەرگیز ماڵی پێ دروست ناکرێت، بەڵام دەکرێت، بەڵام شڕو شەخەڵ با، بەڵام هەرگیز نەیدەتوانی ماوەی دوانزە سەدە-ئێستا چواردە سەدە زیاترە- خۆی رابگرێت و هەرگیز

[1] - پاڵەوانان و پاڵەوانێکی بەرزراگر، ص 95.

سەدو هەشتا ملیۆن شوێنکەوتەی بۆ کۆنەدەکرایەوە – ئێستا لە ملیارێك موسڵمان زیاتر هەیە–، دەبو خێرا بکەوتایە..بۆیە شتەکان ساختە کراون و لەخشتەبراون، وێنەی دراوی ساختە، لە ئەنجامی دەستی خراپ لێکهەڵدەوەشێ، رۆژێ دێ سروشت ئاگرێکی بڵێسەدار هەڵگیرسێنێ، شۆڕشی فەرەنسی و هاوشێوەکانی لەسەر راستیەکی گەورە دروستبوون کە ئەویش ئەوەیە دراوی ساختە هەر بە ساختەیی دەمێنێتەوە.[1]

بەڵکو بەهێزو تواناوە دژ بە بانگەشەکەری بیردۆزەکە رێ دەکات، لەراستیدا پێغەمبەر(ﷺ) بە تەواوەتی لەو شوێنە گشتی و ئاسایی و ئارامە ژیا تا گەیشتە گەرمەی پێگەیشتنی، چل ساڵ ژیا بێ ئەوەی باسی سروشی ئاسمانی هەبێت، هەموو خەمی لەو چل ساڵەدا ژیانێکی ئارام بوو، ئەوەش ناوبانگی بوو و ئەو دەرودراوسێیەی کە دواتر لە دژی بوون رایەکی جوانیان هەبوو بەرامبەری.

چاوچنۆکی؟ هەموو عەرەب دەیانتوانی چی ببەخشن بەو پیاوە؟ تاجەکەی قەیصەر و کیسرای فارس و هەمو سەرزەوی دەیناتوانی چی بکەن بۆ ئەو پیاوە؟ هەرچۆنەو هەرچەندە بوایە، دوای چەند ساڵێکی تر چی دەبوو؟ دەبووە گەورەی مەککە یان نیمچە دوورگەی عەرەبی، پارچەیەك زێری دەبوو و بە دەستیەوە دەبوو؟؟؟ دەی هەموو ئەوە رزگارکردنی

[1] - پاڵەوانان و پاڵەوانێکی بەرزراگر، ص 58.

مرۆڤێك دەهێنێت؟ بە دڵنیاییەوە دەڵێم نەخێر، چونکە هەموو ئەوانەی تری جێدەهێشت، دەی خاوەنی ئەو بیردۆزەیە شیاوی بە گەورەدانان نییە؟ ئایا شیاوی ئەوە نیە چاوپۆشی لێ بکەین؟[1]

- تۆمەتی تاوان:

تاوانی گەورە ئەوەیە هەست بە هیچ نەکەین، خوێنەرانی کتێبی پیرۆزیش لە سەروو هەموویەوەن، لەوانەیە کەسێکیان بیربکاتەوە، لەوانەیە چاکتر بزانێت، کێیە ئەو بانگهێشت کراوەی کە کتێبی نەخوێندووەتەوە، یووسفی پاشای عیبری بەشی خۆی لە تاواندا داکەوت، تاوانەکانی لە خراپەدا گەیشتنە لووتکە، هیچ پێویستیەکیش بە تاوان نەبوو،[2] دوای ئەوە باوەڕداران بە گاڵتەوە دەچرسن ئایا ئەوە ئەو پیاوەی ئێوە نەبوو کە دڵی خۆی دەدایەوە لای خوا؟ ئەگەر مەسەلەکە گاڵتە بێت ئەوە شتەکە سەتحیە، ئەی ئەو تاوانانە چین؟ وردەکاری ئەو ژیانە چیە؟ ئەگەر نهێنی شاراوەی بریتی بێت لە پەشیمانی و فیتنەو حەق و زۆر جاریش سەرسامیو خەباتێکی لەبیرنەکراوە، ئەمانە بۆ کەسێك نابن کە هەنگاوی راست دەنێت، لەگەڵ ئەو

[1] - پاڵەوانان و پاڵەوانێکی بەرزراگر، ص 72-73.

[2] - ئەمە دیدو وتەی جوولەکە و مەسیحیەتە سەبارەت بە پێغەمبەرانی خوا، تۆمەتی ئەوان بۆ پێغەمبەران بەزاندنی حەرامەکان و زینا و تەنانەت قەتڵیشە، تاوانی گەورە دەدەنە پاڵ پێغەمبەران و راستی ئەوەش دەدەنەوە پاڵ کتێبی پیرۆز.

تاوانانەشدا پێت وایە کابرا تەوبەیەکی راستگۆیانەی کردبێت؟ تاوانی سەخت و لەناوبەر ئەوەیە هەستی خۆبەزلزانیت هەبێ‌و خۆت بە هەڵە نەزانیت، ئیتر ئەوە مردنە، دڵێ بە تەواوەتی هەست نەکات بە نیازپاکی و مرۆڤبوون و حەق، ئەو دڵە مردووە، وەك خۆڵێکی وشکی مردوو وایە.[1]

## ئومەتی شمشێر

له دیدی رۆژئاوای مەسیحیەوە گەورەترین تاوانی موحەممەد (ﷺ) ئەوەیە کە رێی نەداوە لەلایەن دوژمنانیەوە سەری بپەڕێنرێ یان لەخاچ بدرێ، بەڵکو بەرگری کردووە لە خۆی و شوێنکەوتەکانی و دواجار توانی سەربکەوێت بەسەر دوژمنانیدا، سەرکەوتنی موحەممەد بێهیوایی تاڵی مەسیحیەکانە، ئەوان پێیان وایە موحەممەد بڕوای بەوە نەبووە لەپێناو سڕینەوەی تاوانی خەڵکی خۆی بکات بە قوربانی، بۆیە بڕوای هێناو سروشتیش گۆڕا، لە باری ئاساییدا هەموو کەسێ مافی ئەوەی هەیە بەرگری بکات لە خۆی و ماڵ‌و موڵکی و چەندە گنجاو بێت هەوڵی بدات تۆڵەی خۆی لە نەیارانی بکاتەوە.

دەربڕی ئەم دەستەواژەیە جیبۆنە کە مامۆستای مێژووەو لە کتێبەکەیدا (راگەیاندن‌و رووخانی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی) ئەمەی وتووە،

[1] - پاڵەوانان و پاڵەوانێکی بەرزراگر، ص 61.

ململانێ و سەرکەوتنی بەسەر هێزی کوفر و خراپەدا وایکرد نووسەرانی ئینسکلۆپیدیای بەریتانی گوڕو تین بیانگرێت و لە بارەی موحەممەدەوە (ﷺ) بنووسن (موحەممەد لەنێو هەموو کەسایەتیە ئایینیەکاندا سەرکەوتنی زیاتری بەدەستهێنا).

جا دوژمنان چۆن دەتوانن دیاردەی سەرکەوتنی موحەممەد(ﷺ) باس بکەن ئەگەر بە رەخنەلێگرتنی نەبێت، ئەوان لێرەوە دەڵێن موحەممەد(ﷺ) بە شمشێر ئایینی بڵاوکردوەتەوە، دەڵێن ئیسلام بە کەچکردنی گەردنی خەڵکی خۆی سەپاندووە.

هەرچۆنێ بێت مێژوو روونە، ئەو ئەفسانەی دەڵێت موسڵمانان بە دانانی شمشێرەکانیان لەسەر گەردنی ناوچە داگیرکراوەکان جیهانیان گرتەوەو ئیسلامیان سەپاند، لە ئەفسانە زۆر خەیاڵی و نامەعقوولەکانە کە هیچکات مێژووناسان باسیان نەکردووە.[1]

پێویست ناکات بۆ زانینی ئەوەی موسڵمانان ماوەی حەوت سەد و سی و شەش ساڵ فەرمانڕەوایی ئیسپانیایان کردووە وەك ئولیری مێژوونووس بیت، لەکاتێکدا درێژترین ماوەی فەرمانرەوایی مەسیحیەکان بەسەر موسڵماناندا لە مۆزەمبیق پێنج سەد ساڵ بوو، ئەوان دەستیان گرت بەسەر

---

[1] - دی لاسی أولیری: الاسلام فی مفترق الگرق، ص 8.

مەرێمی ئەو فەرمانڕەوایەی پێی دەوترا مووسا بن بیق، ناشتوانن بە جوانی ناوەکە دەرببڕن، لێرەوە ناوەکە کرا بە مۆزەمبیق، ئێستا دوای پێنج سەدە دەستڕۆیی مەسیحی لەوێدا هێشتا شەست لەسەدی خەڵکەکە موسڵمانن.

لەکاتێکدا دوای هەشت سەدە لە ئیسپانیا موسڵمانان بە یەکجارەکی لەو وڵاتە دەرکران تەنانەت پیاوێکیان نەهێشتەوە تا بانگێك بدات، جا ئەگەر موسڵمانان بە هێز یان سوپا یان ئابووری بڵاوبوونەوە چۆن مەسیحیەك لە ئیسپانیا دەما تا موسڵمانان بکاتە دەرەوە، دەکرێت کەسێك سەرکۆنەی موسڵمانان بکات کە بارەکەیان قۆستوەتەوە، بەڵام ناتوانێت تۆمەتباریان بکات بەوەی بە بەکارهێنانی شمشێر ئیسپانیەکانیان ناچار کردون موسڵمان بن.

ئەمڕۆ هێشتا لە هەموو بەشەکانی جیهاندا ئیسلام بڵاو دەبێتەوەو موسڵمانانیش بێ شمشێر و بێ چەکن.

هەروەها موسڵمانان ماوەی هەزار ساڵ هیندیان بەدەستەوە بوو، دواجار لە ساڵی 1974 ز. دا نیمچە کیشوەرەکە سەربەخۆیی خۆی وەرگرت و هیندۆسەکان سێ لە چواری دەوڵەتەکەیان برد و موسڵمانانیش چارەکێکی دەوڵەتەکەیان بەرکەوت، بۆچی؟ چونکە موسڵمانان ئیسلامیان بەزۆر نەسەپاندبوو بە سەر هیندۆسەکاندا.

موسڵمانانی هیندو ئیسپانیا نموونەی گەورەیی موسڵمانان بوون، ئەواز گوێڕایەڵی فەرمانی خوا بوون:

﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ ﴾ البقرة: ٢٥٦

موسڵمانە فەتحخوازەکان لەمەوە تێگەیشتن زۆرکردن لەگەڵ ئایینی حەقدا ناگونجێت، چونکە:

یەکەم: ئایین پشت دەبەستێت بە ئیمان و ویست، ئەگەریش ئەوە پەیوەست بە هێز کرا ئیتر هیچ واتایەکی بۆ نامێنێتەوە، هێز دەتوانێت سەرکەوێت، بەڵام ناتوانێت کەس ناچار بکات بە ئاییندارى.

دووەم: ڕەحمەت و ڕاستی ڕێی خوای گەورە بە ڕوونی نیشان دەدات. چونکە پێویست ناکات کەسێك بیەوێت بگاتە بنەماکانی ئیمان هیچ جۆرە گومانێ لە عەقڵیدا هەبێت.

هەمیشە چاودێری و ڕێنمایی خوا بۆ ڕزگاربوونمان لە تاریکیەوە بەرەو ڕووناکی بەردەوامە.

جگە لە کەمینەیەکی نامۆ نەبێت، موسڵمانان بەگشتی لەو ناوچانەدا کە دەستی بەسەردا دەگرن و زاڵن تیایدا، گوێڕایەڵی فەرمانی پەروەردگارین دەبن.

ئەندۆنیسیا: ئەوە راستیەکە کە زیاد لە سەد ملیۆن موسڵمانی ئەندۆنیسی لەوێ هەن، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ سوپایەکی موسڵمانان پێی نەخستووەتە ناو یەکێك لەو دوو هەزار دوورگەی ئەندۆنیسیا.

مالیزیا: زۆرینەی هاوڵاتیانی ئەو وڵاتە موسڵمانن، کەچی یەك سەربازی موسڵمان پێی نەخستووەتە ئەوێ.

ئەفریقیا: زۆرینەی خەڵکی کەناراوی رۆژهەڵاتی موسڵمانن بەهێندەی ئەوەی بەرەو خوارەوە دەچیت هەروەك لە مۆزەمبیقیش وایە، هەروەها هاوڵاتیانی کەناراو رۆژئاوای کیشوەرەکە موسڵمانن، بەڵام مێژوو هیچ غەزایەکی موسڵمانانی لە هیچکامیاندا تۆمار نەکردووە، ئیتر شمشێری چی؟ بازرگانان کاری خۆیان کردووەو ئاکاری جوان و رەوشتی باڵایان موعجیزەی موسڵمانبوونی ئەو خەڵکەی لێکەوتوەتەوە.

بەرێز دیدات ئەوەی دەیڵێیت راست دەردەکەوێت، ئەمە قسەی مەسیحیەکانی بەرامبەرمە، ئەمەش دەڵێن: بەڵام ئێمە باسی ئیسلام دەکەین لە سەرەتای هاتنیەوە، ئەو رێگەی کە پێغەمبەرەکەتان بتپەرستەکانی پێ موسڵمان کرد، ئەگەر بە شمشێر نەبوو ئەی چۆن توانی ئەوە بکات؟

یەکێك بەرامبەر هەموان

چاکترین شت ئەوەیە رێ بدەین تۆماس کارلایل دژ بەو تۆمەتە ساختانە بەرگری لە پێغەمبەرە پاڵەوانەکەی بکات:

ئایا بەراست ئەوە شمشێر بوو؟ لەکوێ بەدەستی بخات؟ ئەمە رایەکی نوێیە، کە لە تاکە کەسێکدا سنووردار کراوە.

تا ئێستا تەنها کەسێك بووە، تەنها کەسێ دژی جیهانێکی بێباوەڕ، پیاوێ بەرامبەر بە هەرچی پیاوی ترە، ئەگەر شمشێرێ هەڵگرێ و بیەوێت ئاوا بڵاوی بکاتەوە، ئەوە کاریگەری کەمی دەبێت، هێندەی توانای خۆی بڵاو دەبێتەوە، تەنانەت لە ئایینی مەسیحیەتدا نابینین گرنگیەکی نەدرابێت بە شمشێر تەنانەت بۆ یەك جاریش بێت، خۆ بوون بە مەسیحی شارلەمانجیە سەکسۆنیەکان لەرێگەی ئامۆژگاریەوە نەبوو.[1]

کاتێك لە تەمەنی چلساڵیدا موحەممەد (ﷺ) رایگەیاند لە ئاسمانەوە پەیامی خوایی بۆی هاتووە، حیزبێکی سیاسی یان بنەماڵەیەکی پاشایەتی نەبوو، هیچ خێزانێ یان هۆزێ نەبوو بۆی بگەڕێتەوە، عەرەبەکان لە بتپەرستیدا رۆچووبوون، بەهەرحاڵ رازیش نەبوون ئەو رێنمایی و ئایینە وەربگرن، زۆر بیریان لای تۆڵەو جەنگی لەناوبەر و براکوژی بوو و

---

[1] - پاڵەوانان و پاڵەوانێکی بەرزراگر، ص 80.

ناونیشانەکەیان بریتی بوو(دژایەتی هەمە چینە)، جا یەك تاکە کەس لەنێو ئەو خەڵکە دەشتەکیەدا پێویستی بە موعجیزەیەکی گەورە بوو، موعجیزەکەش روویدا، خوای گەورە خۆی یارمەتییەکی کەم و لاوازی کردە هۆکارو ئیسلام و موحەممەدی (ﷺ) سەرخست، خوای گەورە بەڵێنی خۆی بردەسەر﴿ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴿٤﴾ ﴾ الشرح: ٤

ئەو ئایینانەی لەمڕۆدا لە گەشەدان

شمشێری عەقل:

دوژمنان و گومانسازان و موژدەبەرانو شوێنکەوتوانی سەربازگە نادیارەکەیان بەرامبەر ئیسلام دەمیان ناوەستێنن و دەڵێن ئیسلام بە شمشێر بڵاوبوویەوە، بەڵام ئامادە نین وەڵامی ئەم پرسیارەمان بدەنەوە: کاتێك لە ساڵی 1840ز.دا کارلایل بەرگری کرد لە موحەممەد (ﷺ) و بانگەشەی شمشێری هەڵوەشاندەوە، کێ بەرتیلی دا بە کارلایل؟ خۆ کەس لە دەوری نەبوو تا بەرتیلی پێ بدات؟ هەموو جیهان ئیسلامی لە تەنگژەدا بوو و دەوڵەتە ئیسلامیەکانیش کەمێکیان نەبێت وەك ئێران و ئەفغانستان و تورکیا کە تەواو سەربەخۆ بوو ئەوانی تر لەژێر دەستڕۆیی مەسیحیەتدا بوون، ، نە دەوڵەمەند بوون و نە دۆلاری نەوتیان هەبوو تا بەرتیلی پێ بدەن.

ئەوە دوێنێ و ڕۆژانی پێشوو، ئەی ئەمڕۆ لە سەردەمی نوێدا؟ خ ئیسلام لە هەموو ئایینەکانی تر خێراتر گەشە دەکات، هەموو دەستەو تاقمە مەسیحیەکان گەشەیان زۆرەو گەیشتوەتە سەدو سیو هەشت لە سەد، بەڵام زیادبوونی ئیسلام زۆر زیاترەو دووسەدو سی و پێنج لە سەدە، ئەمە لە هەمان ماوە لە نیوەی سەەیەکدا، وێڕای ئەمە ئیسلام لە بەریتانیاو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا زۆر خێراتر بڵاودەبێتەوە، دەوترێت لە بەریتانیا موسڵمانانێ زیاتر لە مەنهەجیەکانی ناو دەوڵەت هەن، مافتە بپرسیت ئەمەیان چ شمشێرێکە؟وەڵامەکە ئەوەیە شمشێری حەقە)تۆماس کارلایل) شمشێری عەقڵە، بەدیهاتنی بەڵێنێکی ترە:

﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾ ﴾ الفتح: ٢٨

(خوا زاتێکە کە پێغەمبەرەکەی ناردووە بە ڕێنموونی و ئاییینی ڕاست بۆ ئەوەی زاڵی بکات بەسەر هەموو ئاییینەکاندا بە گشتی هەر چەندە بت پەرستان پێیان ناخۆش بێت.)

سەرەنجامی ئیسلام بە دەستەواژەی روون دیاری کراوە، ئیسلام زاڵبوون و سەرکەوتنی بەسەر هەموو بیروباوەڕێکی تردا هەیە:

﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ٣٣ ﴾ التوبة: ٣٣

لە عەرەبیدا وشەی دین واتەی ڕێی ژیان، واتە هەموان دەگرێتەوە، ئیتر هیندۆسی بێت یان بووزی یان مەسیحی یان جوولەکەیی یان شیوعیەت یان هەر بیروباوەڕێکی تر.

ئەمە سەرەنجامی ئایینی خوایەو هەمان ئایەت لە سورەتی 61 لە ئایەتی نۆدا دووبارە بووەتەوەو کۆتاییەکەی ئەمەیە(وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ )

سەرکەوتنی ئیسلام:

ئیسلام سەردەکەوێت، ئەمە بەڵێنی خوایە، بەڵێنی حەقەو دێتەدی؟ بەڵام چۆن؟ تەنانەت ئەگەر چەکی لەیزەرمان هەبێت ئایا دەتوانین بەکاری بهێنین؟ قورئانی پیرۆز ڕێمان پێ نادات بۆ موسڵمانبوون زۆر بەکاربهێنین، هەر لە ئایەتەکەدا هاتووە کە ئیسلام سەردەکەوێت بەسەر هەموو ئایینەکانی تردا، کەواتە سەرکەوتنی ڕێنماییەکانیەتی کە برێ بیروباوەڕ و بیری ئایینی داوە بە چەند خوێندنگەیەکی جیاوازی بیروباوەڕەکان لە جیهاندا، لەگەڵ ئەوەشدا ناوی ئیسلامی لێ نەنراوە، بەڵکو بەناوی چاکسازی و گۆڕانکاریەوە،

ڕێنماییەکانی ئیسلام زۆر خێرا ڕێکخستنە ئایینیە جیاوازەکانی دەوڵەمەند کردووە، چەندین شت هەن کەتایبەتن بە ئیسلام و پێشتر نەناسراو بوون و پێستر لەلایەن هەندێ دەستەو ڕێبازی ترەوە بە زمان و ئاسن دژایەتییان ەکرا، کەچی ئێستا بەشێکە لەو بیروباوەڕە:

برایەتی مرۆڤ،

لەکارخستنی سیستمی چینایەتی کۆمەڵایەتی،

مافی میرات بۆ ئافرەت،

کردنەوەی شوێنی پەرستش بۆ هەموان،

مەترسی ماددە بێهۆشکەرەکان،

چەمك‌و واتای حەق بۆ یەکخواپەرستی، ئەمەو چەندینی تر.

تەنها یەك وشە لە بابەتی کۆتاییدا، پێش ئەوەی هەنگاو بنێین پرسیار دەکەم لە هەر یەکخواپەرست یان هاوەڵدانەرێ یان کەسێ بڕوای بەوە هەیە هەموو شتێ خوایە یان ئەوەی بڕوای بە سیانەخوایی هەیە، دەپرسم بڕوات بە چەند خوا هەیە؟ لەوانەیە بڵێت جگە لە یەکێك چی تر هەیە؟ دەی ئەوە کاریگەری یەکخواپەرستی حەقی ناو ئیسلامە.

(بیروباوەڕی موحەممەد هیچ گومانێکی ناڕوونی تێدا نیە، قورئانیش شایەتیەکی گەورەیە لەسەر یەکخواپەرستی).[1]

## بڕیاری ڕۆژهەڵاتیە ناموسڵمانەکان:

تا ئێستا هەموو ئەوانەی هێنانمان کە بەرگرییان دەکرد لە موحەممەد و بێ ترس دژی ئەو بیرۆکە درۆزنانە بوون کە دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) بە شمشێر ئایینەکەی بڵاوکردووەتەوە ڕۆژئاوایی بوون، جا ڕێ بدەن ئێستا وتەی هەندێ ڕۆژهەڵاتناس لەو بارەوە بزانین:

هەرچەندە زیاتر بخوێنمەوە زیاتر تێدەگەم کە ئیسلام بە شمشێر بڵاو نەبووەتەوە. (مەهاتما گاندی باوکی هیندی نوێ لە کتێبی هیندی بچووک).

ڕەخنەگرانی موحەممەد لەبری ئەوەی بە ڕووناکی ببینن بە ئاگر دەیبینن، لەبری ئەوەی وەك پاکی و بۆنی خۆش تەماشای بکەن بە بێزراوی تەماشای دەکەن، ئەوان سەرقاڵی شێواندنن و هەر سیفەتێکی چاك بە کەمی و زەبوونی ناو دەبەن، ئەوەش ڕەنگدانەوەی فیسق و لادانیانە).

[1] - جیبۆن: دارمان و ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمان.

رەخنەگران کوێر بوون و ناتوانن تاکە شمشێری موحەممەد ببینن کە توانی بە چاکی بەکاریبهێنێت، شمشێری رەحمەت و میهر و هاوەڵێتی و لێبوردەیی پێ بوو، ئەوەی سنووری بۆ دوژمنان دادەنا و دڵی پاك دەکردنەوە، شمشێرەکەی زۆر لە شمشێری ئاسنین بڕەرتر بوو. (باندت گیاندرا دیف شارما شاستری لە دیداری جوارکبیور، هیند 1928).

پێی باش بوو کۆچ بکات نەك جەنگی دژ بە هۆزەکەی بکات، بەڵام کاتێك هۆزەکەی لە بازنەی چەوساندنەوەوە چوونە بازنەی هێرسش بردن، ئیتر شمشێری هەڵگرد بۆ بەرگری کردن لە گیان، ئەوانەی بڕوایان وایە ئایین دەکرێت بە هێز بڵاو بکرێتەوە بێئاگان، رێی دین و دنیا نازانن، شانازی بەو بڕوای خۆیانەوە دەکەن چونکە دوورن و لە رێیەکی دوور لە راستیەوەن. (رۆژنامەنووس سیخی لە (نەهاوان هیندوستان) دلهی 17 نۆڤەمبەری 1947ز.).

رویارد کیلبنج دەڵێت(رۆژهەڵات رۆژهەڵاتەو رۆژئاواش رۆژئاوایەو ناکرێت بەیەك بگەن)، بەڵام هەڵەیە، بەرگری لە موحەممەد هەموو ئەوانەی بەدرۆ خستەوە کە کوێرانە بڕیاری ئەوەیان داوە ناکرێت مۆرکەکان کۆبکرێنەوە.

سێ پێوەری تر:

دوای چواردە ساڵ لەوەی تۆماس کارلایل سەبارەت بە پێغەمبەرە پاڵەوانەکەی وانەیەکی پێشکەش کرد، کەسێکی فەرەنسی کە پێی دەوترێت لامارتین کە لە مێژووی تورکەکاندا ناوی هەیەو لەبەرئەوەی تورکەکانیش موسڵمانن لامارتین هەندێ لایەنی ئیسلام و دامەزارنی ئیسلامی باسکردووە هەروەك چۆن جولزماسرمان باسی کردبوو، سەدەیەك پێش ئەو لامارتین بیری لە سێ پێوەری تر کردبوویەوە بۆ پێدانی گەورەیی، بۆیە دەبێت ڕۆژئاوا ڕێزی ئەو دیدو ڕوانینە بگرن، لامارتین پێی وایە:

ئەگەر مەبەست لە گەورەیی و کەمی پێناو ئەنجامە سەرسوڕهێنەرەکان ئەو سێ پێوەرە بن بۆ هەڵکەوتەیی مرۆیی، جا کێ دەوێرێ هەر کەسێکی گەورەی مێژووی نوێ بەراورد بکات بە موحەممەد، موحەممەدی فەیلەسووف و وتاربێژ و پێغەمبەر و یاسادانەر و جەنگاوەر و پێشڕەوی هزری و نوێگەری بیروباوەڕی عەقڵانی و پەرستشکاری دوور لە بت و پەیکەر و دامەزرێنەری بیست ئیمپراتۆریەتی دنیایی و یەك ئیمپراتۆریەتی ڕۆحانی، ئەوە ئەو موحەممەدەیە.

وەك سیفەتی خوێنەریمان و بە هەموو پێوەرەکانی گەورەیی کە دەکرێت پێوانەی مرۆڤی پێ بکەین، دەکرێن بپرسین ئایا کەس هەیە لەو گەورەتر بێت؟ (لامارتین هیستوری دی لاتریك، پاریس 1845ز).

ئەو پرسیارەشی لەرووی دەربڕینەکەیەوە دیارە کە ئەوە دەگەیەنێت: هیچ پیاوێکی گەورەتر لە موحەممەد (ﷺ) نیە، ئەو گەورەترین پیاوە پێی نابێتە سەر زەوی.

خوا دەفەرموێت: ﴿ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴿٤﴾ ﴾ الشرح: ٤

زۆرجار پەلە دەکەن و خێرا دەڵێن ئەی مەسیح چی؟

پێش ئەوەی پاکی لامارتین باس بکەین سەبارەت بە بێلایەنبوون یان دوورگرتنی لە بەرتیل وەرگرتن، سێ پێوەرەکە دێنین، بزانین ئایا بەراست موحەممەد (ﷺ) دەگرێتەوە؟

## مەبەستی گەورەیی؟

مێژووی ئەو سەردەمە پێت دەڵێت ئەو ماوە تاریکترین ماوەی مرۆڤایەتی بووە، کاتێك فەرمان کرا بە موحەممەد (ﷺ) پێغەمبەرایەتی خۆی رابگەیەنێت، زۆر پێویست بوو لە هەر پارچەیەکی جیهاندا پێغەمبەران دەرکەون، یان پێغەمبەرێ بنێردرێکە شیاو بێ بۆ پەیامی هەموو جیهان تا رزگاری بکات لە بوهتان و ئەفسانەو خودپەرستی و شیرك و چەوساندنەوە، ئەوەبوو خوای گەورە پێغەمبەرەکەی خۆی لەنێو عەرەبدا هەڵبژارد، ئەوانەی لەوپەڕی دواکەوتەیی و چەقبەستووییدا بوون، تا ئەو پێغەمبەرە ببێتە پێغەمبەری هەموو جیهانیان، قورئانی پیرۆزیش وا تۆماری کردووە:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾ الأنبياء: ١٠٧

ئێستا پرسیاری رەگەزو رەچەڵەك و گەل مەكە، ئایا بۆ گەلی هەڵبژێردراوە یان وەچەی ئیبراهیمە یان وەچەی داوودە یان هیندۆسی ئاریا فارتایە یان جوولەكەیە یان عەرەبییە یان عەجەمی فارس یان تورك یان تاجیكی یان ئەورووپی یان ئاسیاییە، سپی پێستە یان رەشپێستە یان رەنگاورەنگە یان سامیە یان مەنگۆلیە یان ئەمریكیە یان ئوسترالیە یان پۆلیسانیە، هەموو ئەمانە مرۆڤ و دروستكراوی خوان كە بەرپرسیارێتی رۆحییان هەیە تا بنەما جیهانیەكان پەیرەو بكەن.

## عیسای جیاكار:

پێغەمبەری پێشوو كە پێش موحەممەد هات ئاوا ئامۆژگاری خوێندكارەكانی دەكات:

(پیرۆزی مەدەن بە سەگەكان) واتە جگە لە جوولەكە(مرواری خۆیشتان مەخەنە بەردەم بەراز) واتە جگە لە جوولەكە (مەتا 7: 6).

هەموو نووسەرانی ئینجیل یەكدەنگ ئەوەیان تۆمار كردووە كە عیسا بەپێی ئەو رێنماییانە ژیاوە كە بڵاوی كردووەتەوە، لە ماوەی ژیانی خۆیشیدا

بانگەوازی یەك كەسی ناجوولەكەی نەكردووەو لە راستیشدا بە سووكایەتیەوە[1] ئافرەتێكی ناجوولەكەی دەركردووە كە بەدوای بەرەكەتی رۆحی عیسادا گەراوە(لە مەرقەسدا هاتووە ئافرەتەكە یۆنانی بووە)، دوای ئەوە لە ماوەی عیدولفەصح لە قودس كە مامۆستا و خوێندكارەكان لەو بۆنەیەدا كۆبوونەوە، هەندێ یۆنانی دیاریكراو وتەیان بیست و ویستیان ببنە جەماوەری تا رووناكی رۆحییان بەربكەوێت، بەڵام عیسا باڵێكی ساردی پێدان–واتە بە زبری و بێ هیچ سۆزێك هەڵسوكەوتی كردووە لەگەڵیان– وەك چۆن یووحەننا ئەوە دەگێڕێتەوە:

(خەڵكانێكی یۆنانی لەوانەی كە سەركەوتن تا لە جەژندا سوجدە ببەن، ئەوانە هاتن بۆ لای فیلیبس...داوایان لێكرد ئەی گەورە دەمانەوێت یەسووع ببینین، فیلیبس هات و هەواڵی دا بە ئەندراوس، ئەندراوس و یەسووع هەواڵیان دا بە یەسووع) (یووحەننا 12: 20–22).

[1] – ئەمەش نموونەیەكی درۆ و بوهتان و سووكایەتی ئەهلی كیتابە بەرامبەر بە پێغەمبەرانیان كە دەبوو سیفەتی كەموكورتییان نەدەنە پاڵ. وەرگێڕ.

## بەرزڕاگرتنی دەروون

رستەی پێشوو هیچ ڕووخۆشیەکی تۆمار نەکردووە(مەتا 5: 37)، زیاتر لەسەری دەڕۆن: یەسووع وەڵامی هەردووکیانی دایەوەو وتی کاتی ئەوە هاتووە کوڕی مرۆڤ-واتە خۆی- بەرز ڕاگیرێت) (یووحەننا 12: 23).

## ئاستە بالاکان:

موحەممەد (ﷺ) نەیتوانی بگاتە ئەو ئاستە باڵای ئازاد هەڵسوکەوت کردنە، جا بزانە خوا چۆن بە هەڵسوکەوتی باڵا باسی کردووە، کاتێك سەرکۆنەی پێغەمبەری (ﷺ) کرد لەسەر کابرای نابیان کە پێشتر باسمان کردووە، لەبەرئەوەی موحەممەد (ﷺ) پێغەمبەرێکی جیهانی بوو بۆیە خوای گەورە بڕێ پێوەری زۆر بەرزی بۆ دانا، خوا دەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ۝ ﴾ القلم: ٤

پێغەمبەرێکی جیهانی:

ئەمە تەنها قسەیەك نیەو بەس، بەڵکو بە کرداری وابوو، هەستپێکراو بوو، موحەممەد(ﷺ) چی ئامۆژگاری دەستەی یەکەمی هاوەڵان و شوێنکەوتوانی ئایینی نوێی بکردایە خۆیشی پەیڕەوی دەکرد، لەپاڵ عەرەبدا بیلالی حەبەشی و سەلمانی فارسی و عەبدوڵای کوڕی سەلامی جوولەکە هەبوو، لەوانەیە گومانسازان بڵێن ئەمە چەند ڕووداوێکی ئاسایی بووەو بەس،

بەڵام چی دەبێ راستیە مێژووییەکەی پێش وەفاتی بڵێن کاتێک پێنج نێردراوی نارد، هەرکام لەوانە بۆ لای دەوڵەتێکی دراوسێ، بانگهێشتی دەکردن تا ئایینی نوێ قبووڵ بکەن:

ئیمپراتۆریەتی فارس.

پاشای میصر.

نەجاشی حەبەشە.

ئیمپراتۆریەتی هیرقل لە قوستەنتینیە.

پاشای یەمەن.

ئاوا نموونەی دانا بۆ پەیڕەوی رێبازی پێغەمبەرایەتی، بۆیە مەبەستی گەورەیی بریتیە لە چاکسازی بۆ هەموو مرۆڤایەتی تا لەژێر ویستی خوادا بن، ئایا نموونەیەکی تری جیهانی لە ئایینێکی تردا بوونی هەیە؟ موحەممەد (ﷺ) مەبەستی تۆماری یان لەناوبردنی ژمارەی پێوانەیی نەبوو، بەڵکو ساکار ساکاریێ دەیویست ئەو ئەمانەتە بگەیەنێت کە خوای گەورە پێی سپاردبوو.

## دووەم: لاوازی پێشاوەکان:

موحەممەد کە لەدایك بوو کەوچکێ زێڕ لە دەمیدا نەبوو، سەرەتای ژیانی پاڵپشتیەکی کەمی هەبوو، پێش لەدایکبوونی باوکی مرد، هێشتا شەش ساڵان بوو دایکی مرد، بۆیە لە هەردوو لاوە هەتیو کەوت هێشتا تەمەنیشی کەم بوو، ئینجا عەبدولموتەلیبی باپیری بەرپرسیارێتی گرتە ئەستۆ کە ئەویش دوای سێ ساڵ مرد، ئیتر کە توانای جەستەیی پەیدا کرد کاری شوانەیی مەڕ و بزنەکانی ئەبووتالیبی مامی دەکرد کە موحەممەدی (ﷺ) لەخۆگرتبوو، جا بزانە هەژاری و هەتیوی بۆ منداڵێکی عەرەبی بەراورد بکە لەگەڵ هەندێ بەرپرسیارێتی ئایینی کە هەیبوو، بۆیە سەرت سوڕ دەمێنێ ویستی خوا بۆی چی بووە!

ئیبراهیم باوکی رۆحی هەریەك لە مووسا و عیسا و موحەممەد (ﷺ) بوو، کوڕی کابرایەکی کاسپی سەرکەوتووی سەردەمی خۆی بوو.

مووسا پێغەمبەر لە ماڵی فیرعەوندا گەورە بوو، عیسا پێغەمبەر لەگەڵ ئەوەی وا ناسراوە(دارتاشی کوڕی دارتاش) بووە، مامۆستایەك بوو کە برێ پێناوی ئایینی بەدەستەوە بوو، بوتروس و فیلیپیس و ئەندراوس و چەندینی تر، هەموو ئەوانە هاوکاری بوون و شوێنی کەوتبوون تا پەیڕەوی ئاماژەو فەرمانی بکەن، نەك لەبەرئەوەی بازنەی درەوشاوەی سەری هەبوو، شتێکی وا نەبوو، بەڵکو لەبەر جلە گرانبەها و ئاکارە ئەمیریەکەی، بۆیە دەیتوانی

حوکمڕانی کۆشکەکانی قودس بکات لە بەرژەوەندی خۆی و خوێندکارەکانی. تەنانەت لە کاتی گەرمەی ناو ئاهەنگەکاندا جار هەبوو ئێوارەخوانی ناوازە ئامادە دەکرا، دەبینیت سەرکۆنەی جوولەکە ماددیەکانی دەکرد: (کاتێ بینییان -عیسایان بینی- لەوبەری دەریاوە، پێیان وت ئەی مامۆستا کەی هاتیت بۆ ئێرە؟ یەسووع وەڵامی دانەوەو وتی حەق، حەقتان پێ دەڵێم، ئێوە بۆ من دەگەڕێن نەك لەبەر ئەوەی بەڵگەکانی -راستگۆیی- تان دیبن، بەڵکو لەبەرئەوەی لە نانەکەتان خواردووەو تێر بون) (یووحەننا 6: 25-26).

## هیچ شتێ نەبوو پێشکەشی بکات

بەلام موحەممەد (ﷺ) نان و گۆشتی نەبوو تا پێشکەشی بکات. تەنانەت هیچ جۆرە شەربەتێکی ئەو سەردەمەشی نەبوو، تاکە شتێك دەیتوانی پێشکەشی بکات هەمان خوانە هەژارانەکە بوو، ئەوان شوانی هەژار بوون، لەژێر تاقیکردنەوەو هەژاریدا بوون و دەبوو ئەو تاقیکردنەوەی سەرزەوی تێپەڕێنن و رەزامەندی خوا بۆ داهتوو بەدەست بێنن، جا ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) کتێبێکی کراوەی بەردەمیان بوو، نیشانی دان چۆن بووە، ج لە کەسێتی و سەقامگیری لەسەر ئامانجی و وتەو گوڕوتینی حەقی ئایینی و بلاوکردنەوەی مەردانەی ئامۆژگاریەکانی، هاوەڵانیش شوێنپێی ئەویان

هەڵگرت، جا ڕۆژژمێرەکەی بەڕێز ستانلی لین پۆل بۆ پێغەمبەرمان (ﷺ) زۆر جوان و ڕاست بوو، ناتوانم نموونەیەك لە وتەکانی نەخەمەڕوو:

موحەممەد (ﷺ) لەو کارەیدا زۆر بەگوڕو تین بوو، گوڕو تینیش خوێی سەر زەویەو تاکە شتێکە کە خەڵکی لە هەرای ژیانیان دەپارێزێت، هەندێ جار گوڕو تین بۆ گاڵتەجاری بەکادرێت چونکە پەیوەست دەکرێت بە شتێکی پووچ و بێ ماناوە، یان بێ بەرهەم دەبێت، بەڵام ئەمە موحەممەد(ﷺ) ناگرێتەوە، بەڵکو کاتێك پێویستی بکردایە بە گوڕو تین بۆ سەقامگیری جیهانی شێواو گوڕوتینی بەکاردەهێنا، گوڕوتینەکەی ئەو ناوازەو بۆ پێناوێکی ناوازەش بوو، لەو کەمینە بەختەوەرانە بوو کە بۆ بەدیهێنانی ڕاستیەکی گەورە لە بەهاری ڕاستەقینەی ژیانیاندا گەیشتنە ئەوپەڕی خۆشبەختی، ئەو نێردراوی تاقە خوایەك بوو، بە مردنیشی لەبیر نەکرا و پەیامەکەشی کە کرۆکی بوونی بوو لەبیر نەکرا، بەڵکو مزگێنی هێنا بۆ هۆزەکەی و پلەو پێگەیەکی باڵایشی بەدەستخست، ئەمە هاودەم بە خاکیبوونێکی تەواو و جواندا، ئاستی لاوازیەکەشی لەبەرچاو بوو.

دەکرێت زۆر ئاسان دان بەوەدا بنێیت موحەممەد لەگەڵ ئەوەی سەرچاوەی مرۆیی کەمتری هەبوو بەڵام کەسێکی پیرۆز بوو، هەندێ باری زۆر دەگمەنی تووش بوو، بەڵام قەدەری کۆتایی ژیانی لەسەر زەویدا چی بوو؟ بوو بە گەورەی ڕەهای هەموو نیمچە دوورگەی عەرەبی، جا پێناوەکانی

جووڵەو هەڵسوکەوتی بێسنووری لەو کاتەدا چی بوون؟ واز دێنین بۆ موژدەبەرێکی مەسیحی وەڵامی ئەوە بداتەوە:

هەم قەیصەرو هەم پاپاش لە یەك کەسدا کۆبووبوویەوە، بەڵام پاپایەتی دوور لە درۆکانی پاپا، قەیصەریێ بێ دەوروبەرو قەرەباڵغی قەیصەر، بێ سوپایەکی ئامادەو پاسەوان و کۆشکو داهاتی جێگیر، ئەگەر بڕیار بێت بۆ هەتاهەتایە کەسێك بە ڕێپێدراوی خوایی حوکمڕانی بکات ئەوە موحەممەدە. هەرچەندە هیچ دەسەڵاتو دەزگا و پاڵپشتیەکی نەبوو.(ر.بوسورس سمیس موحەممەد و موحەممەدی، لەندەن 1874، ص 92).

## بەربەستەکانی بەردەمی

لاوازیەکەی بریتی بوو لە بەهێزیەکەی، ڕاستیەکەی ئەوەیە کە پێناوی ماددی نەبوو ببێتە پاڵپشتێ بۆی، بەڵکو متمانەی تەواوی بە خوا بوو، خوای گەورەو میهرەبانیش دەستی لێ بەرنەدا، وەك ناموسڵمانە بەویژدانەکان دەیڵێن سەرکەوتنەکەی زۆر زۆر سەرسوڕهێنەر بوو، کارەکە بە تەواوی هی خوا بوو و موحەممەدیش (ﷺ) هۆکار و پێناوێ بوو کە خوا خستیەگەڕ.

سێیەم: ئەنجامی ڕوون

وتەکەی تۆماس کارلایلت بیر بێت(یەك کەس دژ بە هەموو کەس)، تەنها لە حەجی ماڵئاواییدا سەدو بیست و چوار هەزار کەسی لەگەڵ بوو، وێڕای ئەو هەموو ژن و پیاو و منداڵە باوەڕدارانەی کە ئامادەی ئەو حەجە نەبوون.

لە دوانزەی رەبیعولئەوەلی ساڵی یانزەی کۆچیدا کە هەشتی یۆنیۆی ساڵی 632ی مەسیحی دەکرد، لە گەرمەی نوێژەکاندا پێغەمبەر(ﷺ) گیانی دەرچوو بەرەو(رەفیقولئەعلا)، کاتێك عومەر ئەو هەواڵە ناخۆشەی وەفاتی پێغەمبەری(ﷺ) بیست، خەریك بوو هۆش لەدەست بدات و تەواو شڵەژا و هاواری دەکرد: هەرکەس بڵێت موحەممەد مردووە ئەوە ئەدەم لە گەردنی، بەڵام ئەبووبەکری صدیق هات و دڵنیابوویەوە کە مامۆستا(موحەممەد(ﷺ)) ژیانی دنیای جێهێشتووە، بۆیە لە ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) چوویە دەرەەو لەناو کۆڕو جەماوەرەکەدا وتی: موحەممەد مردووەو مەرگەکەشی راستە، دەی با ئەوانەی موحەممەدیان دەپەرست بزانن موحەممەد مردووە، ئەوانەشی خوا دەپەرستن ئەوا خوا زیندووەو نامرێت.

ئەمە عومەری فاروقی هێور کردەوە، دەی ئەم پیاوە گەورە کە خەلیفەی دووەمی موسڵمانان بوو دەیتوانی لەو کاتەدا پێشبینی ئەوە بکات دوای چواردە سەدە زیاد لە یەك ملیارد موسڵمان لە یەك کاتدا هەن؟ یان

پێشبینی ئەوە بکات ئایینی ئەو پێغەمبەرە خێراترین ئایینی جیهان دەبێت لە بڵاوبوونەوەدا؟

مەسیحیەت شەش سەد ساڵ پێش ئیسلام دەستی پێکرد، وا دەوترێت ژمارەی مەسیحیەکان لە نێو هەموو ئایینەکاندا زیاترە، دەی ئایا ئەمە راستە؟ رێ بدەن لە روانگەیەکی دروستەوە بڕوانین.

(مەسیجیەکان لەم جیهانەدا زیاتر لە بانگەشەکەرانی ئیسلام بانگەشەی مەسیحی بوونی خۆیان دەکەن، بەڵام موسڵمانان زیاتر لە مەسحییەکان پابەندی دینەکەیانن).[1]

لەو وتەی پێشووەوە تێدەگەم بەڕێز بۆدلی هەوڵ دەدات پێمان بڵێت خەڵکی لە جیهاندا و ئەوانەی کە فۆرمی ژمارەی دانیشتوان پڕ دەکەنەوە هێمای راست لە ئایینی مەسیحیەت دەدەن، بەڵام بڕوایان نیە بە بیروباوەڕی مەسیحیەت، دەکرێ ئەو کەسانە ملهوڕ بن یان تاقمی(شجیرات معدیه)[2] بن، دژی ئەوەن جوولەکە یان هیندۆسی یان موسڵمان بن، بۆیە پاشخانێکی مەسیحی نیشان دەدەن تا خۆیان وەك مەسیحی نیشان بدەن،ئەگەر لەم دیدەوە بڕوانین و لەو روانگەوە سەیر کەین کە کەسێکی پەیڕەوی شتێ بکات

[1] - ار سی بودلی: الرسول حیاه محمد، الولایات المتحده، 1969.

[2] - تاقمێکی مەسیحی خاوەن هەستی بەهێزی ئایینین کە سەردانی کلێسایان پێ رەوا نیەو خۆیان نادەنە پاڵچ هیچ گرووپ و کۆمەڵێ.

بڕوای پێچ نەبێت، ئەوە ژمارەی موسڵمانان لە جیهاندا ژیاتر لە ژمارەی مەسیحیەکان.

لە ڕوی زەمەنیەوە، ئیسلام شەش سەد ساڵ دوای مەسیحیەت هات، بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئیسلام دوای مەسیحیەت ئایینی دووەمە، زۆر خێرا پێش مەسیحیەتیش دەکەوێت، چونکە لەمڕۆدا لە هەموو ئایینەکانی تر خێراتر گەشە دەکات، ژمارەکە تایبەتەو دڵسۆزی و پەیڕەوی ئایینەکەش لەلایەن موسڵمانانەوە سەرسوڕهێنەرە.

هەر سێ پێوەرەکەی(نیازی گەورەیی و لاوازی بەردەستیەکان و ئەنجامی دیارو تایبەت لە پێغەمبەردا (ﷺ) هەبوون، ئایا ئیتر لامارتین دەوێرێ کەسێکی تر جگە لە موحەممەد وەك گەورەترین کەس دیاری بکات؟ هەروەها بە بڕێ دەستەواژەی ناوازەی بۆ خوێنەرەکانی داناوە سەبارەت بە پێغەمبەر(ﷺ):

(فەیلەسووف و وتاربێژ و پێغەمبەر و یاسادانەر و جەنگاوەر و پێشرەوی هزری و نوێگەری بیروباوەڕی عەقڵانی و پەرستشکاری دوور لە بت و پەیکەر و دامەزرێنەری بیست ئیمپراتۆریەتی دنیایی و یەك ئیمپراتۆریەتی رۆحانی، ئەوە ئەو موحەممەدەیە، بەپێی هەموو پێوەرەکان کە دەکرێت پێوانەی گەورەترین کەسی مرۆڤایەتی پێ بکرێ و دەکرێ پرسیارێکیدانایانە بپرسین: ئایا کەس هەیە لەو گەورەتر بێت؟)

نەخێر، موحەممەد گەورەترین کەسی سەرزەویە، ئەمەش بەپێی وتەی مێژوونووسی فەرەنسی لامارتین، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴾ الشرح: ٤ پەروەردگارا بە دڵنیاییەوە بەڵێنی خۆت بردەتەسەر.

سیەتی رەحمەت:

ئەوانەی بازاڕگەرمی دەکەن بۆ بانگەشەی مەسیحیەت شانازی بەوەوە دەکەن لەمێژووی مرۆڤایەتیدا هیچ بانگەوازێ نیە بەراورد بکرێت بە بانگەوازی میهرەبانیو لێبوردەیی عیسادا کە لەسەر خاچەکەی بوو دەیوت (باوکە لێیان خۆش بە، چونکە ئەوان نازانن چی دەکەن) (لۆقا 23: 34).

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە لەنێو نووسەرەوانی ئینجیلی پیرۆزدا تەنها لۆقا ئەم وشانەی بۆ روحولقودس تۆمار کردووە، سیانەکەی تر(مەتا و مەرقص و یووحەننا ئەو وشانەیان نەبیستون یان هەستیان پێ نەکردووە. ئیتر یان زۆر بە هیچیان زانیوە یان بەشی تۆمارکردنی نەکردووە، قەشە لۆقایش تەنانەت لەو دوانزە خوێندکارە نەبووە کە عیسا هەڵیبژاردن، بەپێی ئەوانەی پێداچوونەوەی نوسخەی جێمتمانەی کتێبی پیرۆزیان کردووە، ئەو وشانە لە زۆربەی دەستنووسە کۆنەکاندا نەهاتون، ئەمە واتە ئەو دەستەواژەیە خراوەتە ناو کتێبی پیرۆزەوە.

لە نوسخەی مەلیك جیمسدا(تیایدا مافی چاپ بۆ ناوەندی پەخشەکەی تۆماس کارلایل، لە 1984) پێمان دەڵێت ئەو وشانە لە نوسخەی ئەسڵی دەستنووسە ئیغریقیەکانی قەشە لۆقادا نین، واتە لەرێی هەندێ کەسی ئاینیەوە دانراون، هەرچەندە دەقەکە راستەقینە نیە، بەڵام دەیهێنین چونکە سۆزو دڵبۆسووتانێکی گەورە لەخۆ دەگرێت، تیایدا خۆشەویستی تاك بۆ دوژمنانی-و چاوپۆشی هاتووە کە مامۆستا خۆی رێنمای وای بەخشیوە، لێبوردەیی دەبێت بۆ کەسی شیاو بێت، هەرکەس لێبوردە بێت دەبێت لە جێ و شوێنی لێبوردندا بێت، جا قوربانی دەستی ستەم بێت و لە باری لاوازیدا هاوار بکات لێت خۆش بووم، ئەمە مانایەکی نیە، بەڵام ئەگەر بارەکە پێچەوانە بوویەوەو کەسی ستەم لێکراو دەسەلاتی هەبوو بەسەر ستەمکارداو توانی تۆڵە بکاتەوەو سزای کەسەکە بدات، ئەوکات بڵێت لێت خۆش بووم، ئەوکاتە لێخۆشبوون مانای هەیە.

## رەحمەتی موحەممەد (ﷺ):

ئەو پەڕە بانگەشەبۆکراوەی صولب لەگەڵ ئەو سەرکەوتنە مێژووییەی موحەممەد لە مەککە بەراورد بکە لەکاتێکدا موحەممەد دە هەزار هاوەڵی لەگەڵ بوو کەچی خوێنی نەڕشت:

(ئەو شارەی بەوپەڕی زبری لەگەڵی جووڵانەوەو خۆی و کۆمەڵەکەیان ناچار کرد پەنا ببەن بۆ لای بێگانەکان، چیانی خۆی و هاوەڵە دڵسۆزەکانی کەوتە بەر مەتسی ئەو هاوشاریانەی، وا ئێستا لەبەر پێیدا کەوتوون، ئەوانە ئازاربەخشە بێ میهر و دڵرەقەکانی دوێنێ بوون، ئەوانەی حورمەتی مرۆییان لەئاست ژن و پیاوانێکی ئاشتیخوازدا شکاند، ئێستا ژیانیان لەژێر رەحمەتی موحەممەددایە، بەڵام لەکاتی سەرکەوتندا چی ئازارێك درابوو هەمووی سڕایەوەو چی برینێکی بەرکەوتبوو نەیهێشت و لێبوردنی گشتی هەموو مەککەی گرتەوە...) (سعيد أمين علي: روح الاسلام).

لەبەردەم جەماوەری شارە شکستخواردووەکەدا وتاری فەرموو(گومان دەبەن چیتان لەگەڵ بکەم؟) هۆزەکەشی هەر لە منداڵیەوە تا ئەو کاتەی چاك دەیانناسی، بۆیە وتیان رەحمەت و میهرەبانی، برایەکی بەخشندەو برازایەکی بەخشندە، ئیتر فرمێسك لە چاوانی پێغەمبەر (ﷺ) داباری و فەرمووی(یووسف چی وت بە براکانی هەمان شتتان پێ دەڵێم: ئەمڕۆ هیچ تۆڵەیەك نیە بۆتان و برۆن ئێوە ئازادن).

ئەم دیمەنە راستیەکی تۆمار کردووە کە مێژووی هەموو جیهان شتی وای بەخۆوە نەدیوە، دەستە دەستە هاتن و موسڵمان دەبوون، خوای گەورە شایەتی گەورەیی رەفتاری پێغەمبەرەکەی دەدات: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ الأحزاب: ٢١

لامارتین چەند چاکی کرد بێ ئەوەی بزانێت ئەم چاکەی دووبارە کردوەتەوە: (بە رەچاوکردنی هەموو پێوەرەکان بۆ گەورەیی مرۆڤایەتی دەکرێت بپرسیت دەکرێ کەسێ گەورەتر لە موحەممەد هەبێت؟).

دەکرێت لە وەڵامدا بڵێین(هیچ کەسێ نیە لە موحەممەد گەورەتر، موحەممەد (ﷺ) گەورەترین کەسی ناو هەموو ژیان بووە).

تا ئێستاش پاڵەوانەکەمان سەناو وەسفێکی کراوە کە داوا نەکراوە لەو کەسانە وەسفی بکەن، بێ هیچ حەسوودیەك چەندین کەسی ناموسڵمان کە هەڵگری بیروباوەڕی ئایینی جیاوازن و لەرێی چەندین هەوڵی جیاوازی هزریەوە ەسفیان کردووە، بەڵام هێشتا کامڵ نین تا بڕیاری عیسای مەسیح نەهێنین کە پێش موحەممەد هاتووە، ئێستا پێوەری ئەو بۆ پێوانەی گەورەیی دەخەینەڕوو:

## یووحەننای موعەمدان:

یووحەننای موعەمدان لە جیهانی ئیسلامیدا بە یەحیا پێغەمبەر ناسراوە کە پێغەمبەری هاوسەردەمی مەسیح و ئامۆزایشی بووە، مامۆستا لەبارەیەوە دەڵێت (حەقتان پێ دەڵێم، لەنێوتاندا کوڕی ئافرەتێك نیە گەورەتر لە یووحەننای موعەمدان) (مەتا 11: 11).

هەموو مرۆڤێ کوڕی ئافرەتێکە، بەپێی ئەم ڕاستیە یووحەننای موعەمدان لە موسوا و یووسف و سولەیمان و ئیبراهیم و ئیسحاقیش گەورەتر بووە، ناکرێت هیچ پێغەمبەرێکی بەنوئیسرائیل لەو یاسایە دەربکەین، دەی هۆکاری ئەو پلەبەرزیەی یووحەننا بەسەر پێغەمبەرانی تردا چیە؟

مەسەلەکە موعجیزە نیە، چونکە ئینجیل هیچکام لەوانەی تۆمار نەکردووە، مەسەلەکە ڕێنماییەکانیشی نیە، چونکە ئەو وەك یاسادانەر نەهاتووەو ڕێکخستن و بەنامەی نوێی پێ نەبووە؟ ئەی مەسەلەکە چیە؟ زۆر ئاسانە، ئەو پێغەمبەرو موژدەبەرو بێدارکەرەوە بووە بۆ هاتنی مەسیح، ئەمە وایکرد یووحەننا گەورەترین بێت، بەڵام عیسا بۆچی بانگەشەی ئەوە دەکات خۆی لە یووحەنناش گەورەترە؟ (بەڵام من شایەتێکم گەورەتر لە یووحەننا بۆ ئەو کارانەی کە ئەب پێی بەخشیوم تا ڕێگرییان لێ بکەم) (یووحەننا 5: 36).

ئەمە شایەتی راسپاردنێکی خواییە کە متمانەی پێ بەخشیوە، وایکردووە عیسا لە یووحەننا گەورەتر بێت، بەپێی ئەم پێچوەرە واقعیانە وەك مامۆستا باسی کردووە دەبینین:

یووحەننای موعەمدان لە هەموو پێغەمبەرانی تری بەنوئیسرائیل گەورەترە چونکە موژدەی هاتنی مەسیحی گەورەی داوە.

دەی عیساش لە یووحەننا گەورەترە چونکە موژدەی هاتنی روحولحەق، موعزی) داوە کە بڕیارە پێشەنگی هەموو مرۆڤایەتی بکات بۆ هەموو حەقێك. (یووحەننا: 16).

ئوسقوف بوون یان نێردرانی ئەو پێغەمبەرە یان ئەو کارانەی پێی دابوو تا ئەنجامیان بدات، هەموویان لە نێو بەنوئیسرائیلدا سنووردار کرابوون، لەکاتێکدا نێردرانی موحەممەد (ﷺ) جیهانیە، وەك لە قورئاندا بۆمان باسکراوە(وما أرسلناك إلا رحمه للعالمين) (الأنبياو: 107).

بەپێی ئەرکە بالآکەی، پەیامەکەی موحەممەد یەکرەنگ گەیشت بەوانەی کە بیستبوویان، بێ ئەوەی رەگەزێ یان چینێ یان بیروباوەڕێ دیاری بکرێت، بەڵکو هەموان لە ئاییی خوادا کۆدەبنەوە بێ ئەوەی هیچ جیاکاریەك لە هەڵسوکەوت لەگەڵ کەسدا هەبێت، ئیسلام بڕوای بەوە نیە دروستکراوانی خوا(مرۆڤەکان) دابەش بکات بۆ بەرەی سەگ و بەراز وەك

ئەوەی لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە(مەتا 7: 6)، یان بۆ مەڕو بزن(مەتا 25: 32)، بەڵکو نێردراوی تاقە خوایەکی حەق بوو و بۆ هەموو مرۆڤایەتی نێردرا تا رەحمەت بێت بۆ هەموان، بەڵکو رەحمەت بێت بۆ هەموو کەون(قورئانی پیرۆز 21: 107) تا رۆژی وەفاتیشی نێردرانی خۆی و ئامانجی هاتنی لەبیر نەکرد.

کاتێك مانەوەی کاتی لەسەر زەویدا تەواو بوو، ئینجا توانی تەماشای رابردووی خۆی بکات کە چۆن بوو و ئێستا چۆنە، ئیتر دڵنیا بوو دەتوانێ ئێستا راکشێ و بەری رەنجی ببینێتەوە، ئەو خەونی دەدی بە ژیانێکی دوور لە پشێوی و پڕ لە رەزامەندی و ئارامی و حەسانەوە، نەك بۆ خۆی، بەڵکو کاتی حەسانەوەو پاڵدانەوەی نەبوو، بەڵکو کارێکی لەئەستۆ بوو کە دەبوو بەجێی بگەیەنێت و قورئانیش کارەکەی بۆ باسکردوین:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ سبأ: ٢٨

(وە ئێمە تۆمان نەناردووە مەگەر بۆ هەموو ئادەمی بە مژدەدەرو ترسێنەر بەڵام زۆربەی ئادەمی نازانن.)

چۆن توانی لەو تەمەنە گەورەی پێگەیشتنەدا بچێت بەدەم ئەو ئەرکە گەورەوە؟ خۆ داهێنانە ئەلیکترۆنیەکانی ئەمڕۆ بۆ پێناوە نوێکانی پەیوەندی لەبەردەستدا نەبوو، ئەی دەبوو چی بکات؟ جا جگە لەوەش نەخوێندەوار بوو، نووسەرەوەکانی خۆی بانگ دەکرد و بە حونجە بۆی دەخوێندنەوە تا پێنج نامە بنووسن، هەر نامەیەکیان بۆ سەرکردەیەك، یەکێك بۆ ئیمپراتۆری قوستەنتینیەو یەکێك بۆ پاشای میصر و یەکێك بۆ نەجاشی حەبەشەو یەکێك بۆ پاشای یەمەن و یەکێك بۆ ئیمپراتۆری فارس، دوای ئەوە پێنج هاوەڵی خۆی بانگ کردو پێنج ەسپی عەرەبی پێدان و هەرکامیانی نارد بۆ بەرەیەك تا گەلانی جیهان بانگ بکەن بۆ ئایینی جیهانی خوای گەورە.

بەختم هەبوو کە توانیم لە مۆزەخانەی تۆبۆکابی لە ئەستەنبوول لە تورکیا یەکێك لەو نامە پیرۆزانە ببینم، نامەکە تۆزی لەسەر نیشتبوو، تورکەکانیش ئەو پەڕە گرانبەهیان پاراستبوو، بەڵام وەك وتم تۆزی لەسەر نیشتبوو، نامەکە وا دەست پێ دەکات (لە موحەممەدی پێغەمبەری خواوە بۆ هیرەقلی ئیمپراتۆری قوستەنتینیە، موسڵمان بە پارێزراو دەبیت)، دوای ئەوە ئەم دەقەی قورئان هاتووە:

﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾ آل عمران: ٦٤

(ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بڵێ: ئەی خاوەن نامەکان وەرن بۆ لای وتەیەکی ڕاست(یەکسان) لە نێوان ئێمە و ئێوەدا، کە جگە لەخوا نەپەرستین وە هیچ شتێك نەکەین بە هاوبەشی وە هێندێکمان هێندێکمان بە پەروەردگار دانەنێین ئینجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد ئێوەش بڵێن: ئێوە شاهید بن کە ئێمە فەرمانبەرانی خواین.)

دوای ئەوەی ئایەتەکە هاتووە، ئینجا بە چەند فەرمایشتێکی خودی پێغەمبەر(ﷺ) کۆتایی پێ دێت و دواتر مۆری هەڵکۆڵراوی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەری مۆرکراوە(لا معبود بحق الا الله و محمد رسول الله).

نامەکەی ناو تورکیا گرنگیدانی ئێمە بە جۆری پاراستنی نیشان دەدات، بەڵام لەوانەیە پاراستنی خودی نامەکە لەژێر فشاری گەشتیاراندا لەناو بچێت، نامە قورئانیەکەش لە هەموو ماڵێکی موسڵماناندا هەیەو هەزاران جار دەخوێنرێتەوە، وێڕای ئەوەی خوێنەران هەوڵ دەدەن نامەکە بگەیەننە جێی مەبەست.

بە دیدێکی تر، ئەو ئایەتەی پێشوو ئاراستەی ئەهلی کیتاب کراوە، ئەوانیش جوولەکەو مەسیحیەکانن، بەلام زیاد لە هەزار ساڵە گەورەیی ئەرکی سەرشانی خۆمان لەبیر کردووە، کوێرانە لەسەر ئەو ئایەتە دەڕۆین وەك چۆن مار لەسەر کونی نێچیرەکەی دەوەستێ چاوەڕێی دەرفەت دەکەین تا نێچیرەکە راو بکەین، دەی ئەو بێئاگاییە تەواوە بەردەوام دەبێت و نارەحەتی و چەرمەسەری بێشوماری نەوەکانی داهاتووشمان دەگرێتەخۆ، دوای زیاد لە چواردە سەدە لە خوێندنەوەی قورئان بە هەموو جۆرەکانی خوێندنەوەیەوە، هێشتا گوێمان لەو بانگەوازە کاریگەرەیە(وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ).

ئەم دەستەواژە بەشی کۆتای ئایەتەکەیە کە پێش چواردە سەدە دابەزیوە، ئەمە باری راستەقینەی ئایینی جیهانی ئەمڕۆیە، ئەبێت وەلامی ئەو پرسیارە بدرێتەوە: ئەمڕۆ هیچ جیاوازی و ناکۆکیەك هەیە؟ نا بەهیچ شێوەیەك، ئەمڕۆ زیاتر لە باوەڕداران ناموسڵمانەکان بوونیان هەیە.

ئایا هیچ هیوایەك هەیە ئەم بارە بگۆردرێت؟ خوای گەورە لەو کاتەوە فەرمانی کردووە بە پێغەمبەرەکەی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١﴾ المدثر: ١، کە ئەم ئایەتە کاریگەرە جوانە دەبینین چەندە جوان ئایەتەکانی تری بەدوادا دێن، تێبینی سێ خاڵی پەیوەست دەکەین:

یەکەم: بانگەوازێ بۆ کەسێکی دیاریکراو.

دووەم: وانەیەکی رۆحی گشتی.

سێیەم: هیوای بێداریەکی ناروون.

بەپێی یەکەمیان پێغەمبەر(ﷺ) قۆناغی رامانی شەخصی تێپەڕاند و ئیتر ئەرکی سەرشانی ئەو نیە پەیامەکەی بگەیەنێت و هەموان بانگ بکات بۆ لای خوای تاك و تەنها، هەمیشە دڵی پێغەمبەر(ﷺ) پاك و بێگەردە، بەلاَم هەموو کارە دەرەکیەکانی ئیتر لای خوان، بەرزراگرتنی تەقلیدی نەریتی باوباپیران و پەرستشیان دەبێت کەنار بخرێت، کاری پێغەمبەر (ﷺ) وەك پێغەمبەرێ ناوبانگی زیاتر بوو و لە کەسایەتی خۆی گرنگتر بوو، بەلاَم هیچ دەستخۆشی و پێزانینێکی لە هۆزەکەی نەویست، بەلاَم ئەوان تەواو دژایەتییان کرد، ئەوپەڕی خۆڕاگری نیشاندا، رەزامەندی ئەویش پەیوەست بوو بە رەزامەندی خواوە، واتە ئارامی نەدەگرت تا خوا لە خۆی رازی نەکات.

سەبارەت بە دووەم لێرەدا هەمان ئەو قۆناغانە لە ژیانی هەر کەسێکی بۆخوا صوڵحاودا دەردەکەون، چونکە دەبێت ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) نموونەیەکی جیهانی بێت بۆ پێشەنگی.

سەبارەت بە سێیەم: صۆفیەکان لە پەرستش و دیمەنی دەرەکیەوە دیمەنی رووکەشی خۆمان وەردەگرن، ئەوەی پێویستە بۆ گەشەی

جەستەییمان و گەیشتنی بە قۆناغێکی دیاری کراو، بەڵام خێرا دەستبەرداری دەبین، ئەوکات خێرا سورشتی ناخمان خویٚ دەنوێنێ و راشکاوانە خۆی نیشان دەدات، ئەمەش بۆ رێز و دەستخۆشی خەڵك نا، بەڵکو هیوای گەورەی ئەو جۆرە بارەیە کە جار هەیە لەگەڵ سروشتی زاڵماندا بەریەك دەکەوێت و دەبێت بەرگەی هەموو لەخشتەبردنێ بگرێت تا خوا لەخۆی رازی دەکات:

﴿ قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴿٣﴾ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾ وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ ﴿٥﴾ ﴾ المدثر: ٢ - ٥

روجز واتە کاری خراپە، زۆر جار یەکسەر بە بتپەرستی تەماشا دەکرێت با تەنانەت بتێکیش نەبێت بەناوی روجز، بەڵام لەم رۆژانەدا واتاکە فراوانترەو باری عەقڵی نەگونجاو لەگەڵ پەرستشی حەق دەرێتەوە، ئەویش باری گومان و دوودڵیە.

﴿ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴿٦﴾ ﴾ المدثر: ٦

دەقەکە شەرعی و بازرگانیەکە ئەوەت پێ دەبەخشێ کە شیواتەو زیاتر لەوەش کە بەخشیوتە دێتەوە دەستت، بەڵام چاوەڕێی هیچ مەکە لەو کەسەی پێت بەخشیوە، چونکە تۆ بەخشیوتە بە خوا و بەندەکانی خواش رەزامەندی خوایان دەوێت.

﴿ وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ ﴿٧﴾ ﴾ المدثر: ٧

گوێڕوتینمان بۆ بانگەوازی رێی خوا لێمان دەخوازێ خۆڕاگریش بێ-پێویستە سەقامگیری و خۆڕاگری لە هەوڵەکانماندا نیشان بدەین تا خوا رازی بکەین، چونکە ئێمە ئیمانداریین و دەزانین خوای گەورە سوودبەخش و دلنیو بەهێزە، هەموو شتەکانیش بەو جۆرە دەڕۆن کە بڕیاریان لەسەر دراوە.[١]

عەرەب بە گشتی و پێغەمبەرمان(ﷺ) بە تایبەتی عەبایان بەکارهێناوە، ئەویش بۆ خۆپاراستن لە خۆر و رەشەبا و تەپوتۆز، دەبوو ئاوایش کار بکات تا پێچەسپاو بێت و خۆی بپارێزێ تا ئەرکەکەی بەجی بگەیەنێت، هەرچەندە لەمڕۆدا زۆربەی موسڵمانان لە رۆژی ئاساییاندا ئەو عەبایە نادەن بەسەر خۆیاندا، بەڵام عەبای بەرپرسان هەڵدەگرن، ئەمەش وەك جۆرێ لە گرێی دەروونی کە هەست بە کەموکورتی دەکەن.

جا بۆ ئەوەی لەم تاریکاییەی دەورماندا رووناکی خوا وەربگرین دەبێت چی بکەین؟ یەکەمجار پێویستە رێ بدەین رووناکی خوا بە تەواوی لە ناخمد پەخش بێت، بە رووناکی رای ناو دڵانمان دەتوانین چەند هەنگاوێکی راست و چەسپاو بنێین، نەك خۆمان ئەوە بکەین، بەڵکو رووناکیەکە پێشەنگیمان دەکات، بەڵام ئاااخ.

---

١ - عبدالله یوسف علی.

ئەو بەختەوەریەی بەدیدەکەین وامان لێدەکات چرا هەڵکەین و بە براکانمان بڵێین منیش لە تاریکیدا بووم، وا بە بینایی توانیم ئاسوودەیی و خۆشی و رەحمەتی خوا بدۆزمەوە، بەوجۆرە دەبێت ئەوەی بۆ براکانمان پێویستە ئەنجامی بدەین.

خاکیانە هەنگاو هەنگاو لە رێی خوادا و بە هاوکاری و ئارامیەکی دوو لایەنەی برایانە و بە بانگەوازی دڵسۆزانەی هاودەم بە کردار و پشت بە ویستی خوا، ئەوکات دەکرێ بە تەواوی چاودێری و میهری خوایی بمانگرێتەوە. (عەبدوڵا یووسف عەلی).

خوا دەفەرموێت (وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ) ئەم فەرمایشتە بۆ پێغەمبەری ئازیزمان دابەزی، صەلات و سەلامی خوا هەتاهەتایە بۆسەر پێغەمبەرمان.




**بلغ العلى بكماله**

**كشف الدجى بجماله**

**حسنت جميع خصاله**

**صلوا علية وآله**

**(سەعدی شیرازی)**

## پاشکۆی (ب): موحەممەد گەورەترینە

(ئەگەر ئامانج گەورەو پێناوەکان لاواز **و ئەنجامەکان سەرسوڕهەێنەر بوون، ئەو سیانە پێوەری هەڵکەوتەیی مرۆڤن، جا کێ دەتوانێت هەر کەسێکی گەورەی ناو مێژوو لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بەراورد بکات؟**

**کەسە زۆر بەناوبانگەکان تەنها چەك و یاسا و ئیمپراتۆریەت دروست دەکەن، برێ شتیان دامەزراندووە کە ئەگەر هەمیشەیی بن لە هێزی ماددی زیاتر تێپەڕ ناکەن و زۆر جاریش لەبەرچاوان نامێنن، دەی ئەوە موحەممەدە (ﷺ) کە تەنها سوپا و ئیمپراتۆریەت و خەڵك و فەرمانڕەوا و یاسادانانی**

نەبزواندووە، بەڵکو ملیۆنەها کەسی جووڵاندووە، زیاتر لەو پەیکەر و خواوەند و ئایین و هزر و بیروباوەڕانە، پشتی بە کتێبێ بەستووە کە هەر پیتێکی بووە بە یاسایەك، موحەممەد(ﷺ) نەتەوەیەکی رۆحی دامەزراند کە هەموو خەڵکێك و هەموو زمان و رەچەڵەکێکی لەخۆگرتووە.

جا بیرۆکەی یەکخواپەرستی و راگەیاندنی لە نێو جەرگەی بیروباوەڕە خورافیەکاندا، موعجیزەیەك بوو نەك تەنها قسەی سەر لێوان بێ، بەڵکو هەموو بیروباوەڕە کۆنە پووچەکانی لەناوبرد.

نوێژی بەردەوام و موناجاتی لەگەڵ خوا و مردن و سەرکەوتنی دوای مردنی و هەموو ئەو رووداوانە ئەوە دەسەلمێنن کە موحەممەد(ﷺ) بوختانچی نەبووە، بەڵکو بەڵگەیەکی بەهێزی راستگۆیی موحەممەد (ﷺ) دەبەخشن، ئەو بیروباوەڕەش کە بەخشیویەتی لە دوو بەش پێکهاتووە: بەتەنها دانانی خوا و پاکراگرتنی ناوی خوا لە هەر کەموکورتیەك، بەشی یەکەم باسی خوامان بۆ دەکات و بەشی دووەم هەرچی پەیوەست نیە بەخواوەو دراوەتە پاڵی ئەوە بەرپەرچ دەداتەوە.

فەیلەسووف و وتاربێژ و پێغەمبەر و یاسادانەر و جەنگاوەر و پێشرەوی هزری و نوێگەری بیروباوەڕی عەقلانی و پەرستشکاری دوور لە بت و پەیکەر و دامەزرێنەری بیست ئیمپراتۆریەتی دنیایی و یەك ئیمپراتۆریەتی رۆحانی، ئەوە ئەو موحەممەدەیە، بە لەبەرچاوگرتنی هەموو ئەو پێوەرانەی دەکرێت

گەورەیی مرۆڤی پێ بپێورێت، دەکرێت راستگۆیانە بپرسین: ئایا کەسێکی گەورەتر لە موحەممەد هەیە؟[1]

پاشکۆی (ج):

جۆلز ماسرمان: توێژەری دەروونی:

پێویستە سەرکردەکان سێ ئەرك بەجێبگەیەنن...بەختەوەری و خۆشگوزەرانی لە دەسەڵاتیاندا بێتەدی، رێکخستنێکی کۆمەڵایەتی بێننەدی کە خەڵك تیایدا هەست بکەن بە ئارامیەکی رێژەیی، برێ بیروباوەڕ دروست بکەن، کەسانێکی وەك پاستۆر و سۆلك لە دەستەی یەکەمن، کەسانی وەك گاندی و کۆنفۆشیۆس لە لایەك و ئەلکسەندەر و قەیصەر و هیتلەر لە لایەکی ترەوە لە دەستەی دووەم یان دەکرێت سێیەم بن، عیسا و بووزا سەر بە دەستەی سێیەمن و بەس، ئەو سەرکردە گەورەی لە هەموو سەردەمەکاندا هەر سێ ئەرکەکەی پێکەوە بەجێگەیاندبێت موحەممەدە(ﷺ)، بەرێژەیەکی کەمتر لەویش مووسایش ئەوەی کردووە.

[1] - (لامارتين: تاريخ الاتراك، باريس 1854، مج2، ص 276-277).

پاشکۆی (٤٥)

دەوترێت نیازپاکی سیفەتێکی مرۆییە، هەر ئەوەشە پیاوی چاك و راست لە ئاژەڵ جیا دەکاتەوە، بەلام نیازپاکی و دڵسۆزی باڵا فیترەتی ناو سەگەکانە، ئەوەشە هێما و جیاکەرەوەی باشترین هاوڕێ لەناو مرۆڤدا کە زۆر دەگمەنیش بوونی هەیە. (شاعیرێکی باشووری ئەفریقیا).

## باسی یەکەم: تەحەددای هەمیشەیی

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴿٨٨﴾ ﴾ الإسراء: ٨٨

(ئەی (موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)) بڵێ سوێند بەخوا ئەگەر ئادەمی و پەری هەموو کۆببنەوە بۆ ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بێنن ناتوانن وێنەی ئەو بێنن هەرچەندە پشتیوانی یەکتریش بن.)

موعجیزەکە چیە؟

پێم وایە وێنایەکی روونی موعجیزەمان لەبەرچاو بێت، جا چەند پێناسەیەکی موعجیزە کراوە، لەوانە:

رووداوێکە دەردەکەوێت و ناتوانرێت بە یاساکانی سروشت راڤە بکرێت، چونکە لە بازنەی سروشتی چووەتە دەرەوە یان کارێکی خواییە).

کارێکە یان شتێکە یان رووداوێکە کە تەواو سەرسامان دەکات.

کارێکە تەحەددای هێزە مرۆییەکان دەکات، واتە روودانی مەحاڵە.

شتێکی مەنتیقیە شتە موستەحیلەکان بە گەورە تەماشا بکەین. موعجیزەمان لا گەورە بێت، بۆ نموونە وا دابنێ کەسێك لەبەرچاوماندا بمرێت و لەرێی کەسێکی شارەزای پزیشکیەوە مەرگی دڵنیا بکرێتەوە، دواتر شتێکی نارووون یان شەیتانێ فەرمان بکات تەرمەکە هەستێتەوە، لەبەرچاو هەمواند هەستێتە سەر پێ و بچێت بە رێدا، ئیتر دەڵێین ئەمە موعجیزەیە، بەڵام ئەگەر زیندووکردنەوەی مردووەکە دوای ئەوە بوو کە سێ رۆژ خرابێتە ناو گۆڕەوە، ئەوکات دەڵێت موعجیزەیەگی زۆر گەورە، جا ئەگەر دوای دەیان ساڵ یان چەند سەدەیەك تەرمەکە زیندوو ببێتەوە، ئەوکات دەڵێین گەورەترین موعجیزە.

## گەورەترین موعجیزە

هەر لە کۆنەوەو لە کاتەوەی خوای گەورە قەدەری شتەکانی دیاری کردووە، تایبەتمەندیەکی ئاسایی مرۆڤ بووە کە لەبری ئەوەی چاویان لە تایبەتمەندیەکانی ناو پەیامەکە بێت، داوای موعجیزەیان لەو کەسانە کردووە کە خوا وەك پێغەمبەر ناردوونی.

بۆ نموونە کاتێك عیسای مەسیح لەنێو بەنوئیسرائیلدا دەستی کرد بە بانگەواز تا رێڕەوەکەیان بۆ راست بکاتەوەو یاسایەکی شەرعییان بۆ دابنێت و

وایان لێ بکات بە رێنمایی و یاساکانی خوا چێژی رۆحی حەق بکەن، ئەوەبوو بۆ سەلماندنی راستگۆییەکەی داوای موعجیزەیان لێکرد وەك چۆن لە کتێبی پیرۆزی مەسیحیەکاندا تۆمار کراوە:

(دواتر هەندێ نووسەری دیاریکراو و سوارچاك وەڵامیان دایەوەو پێیان وت ئەی مامۆستا داوای بەڵگەیەکت لێ دەکەین، بەڵام ئەو وەڵامی دانەوەو بەوانی وت: نەوەی خراپەکار و ناپاك داوای بەڵگە دەکەن، هیچ بەڵگەیەك نابێت پێی بدرێت جگە لە بەڵگەی پێغەمبەر یونان) (مەتا 12: 38-39).

هەرچەندە عیسا ئامادە نەبوو بەوجۆرە بەڵگە بهێنێتەوە بۆ جوولەکە، بەڵام وەك لە چیرۆکەکانی ئینجیلدا هاتووە چەندین موعجیزەی نیشان دان.

کتێبی پیرۆز پڕیەتی لە رووداوی نائاسایی کە خوای گەورە بەخشیویەتی بە پێغەمبەرانی، لە راستیدا هەموو ئەو بەڵگەو موجیزانە کاری خوای گەورەن، بەڵام کاتێك لەسەر دەستی مرۆڤ دەردەکەون، ئێمە بە موعجیزەی پێغەمبەران ناویان دەبەین بەو واتایەی ئەو موعجیزانە لەسەر دەستی مووسا و عیسا پێغەمبەر روویانداوە.

تایبەتمەندی بەردەوامی:

شەش سەدو ئەوەندە ساڵ دوای لەدایکبوونی عیسای مەسیح موحەممەد (ﷺ) لە مەککەو لە نیمچەدوورگەی عەرەبی لەدایك بوون، کاتێك پێغەمبەرایەتی راگەیاند تەمەنی چل ساڵان بوو، ئەوەبوو هۆزە بێباوەڕەکەی لە مەککە داوای موعجیزەیان لیچکرد هەمان چەشنی جوولەکە کە داوای موعجیزەیان لە مەسیح کرد، بە هەمان چەشنی کتێبی پیرۆز، عەرەبەکانیش رەنگێکی رەفتاری مەسیحیەکانیان وەرگرتبوو، بۆیە مێژوو تایبەتمەندی خۆدووبارەکردنەوەی هەیە.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَقَالُواْ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾ الأنعام: ٣٧

موعجیزە، چ موعجیزەیەك؟

لەناویاندا هاواری کرد موعجیزە، چ موعجیزەیەکتان دەوێت؟ مەگەر خۆتان وانین؟ خوا ئێوەی بەدیهێناوەو لە کەمێك قوڕی وێنای کردون، سەرەتا بچووك و دواتر پاش چەند ساڵێ بوونتان نامێنێ، ئێستا جوانن و هێز و بیرکردنەوەو هەست و سۆزتان هەیە، دواتر پیر دەبن و سەرتان سپی دەبێ و هێزتان نامێنێ و تووشی ترسنۆکی و دنیاویستی دەبن و دواتر لەناو دەچن و هەمدی دەبنەوە بە هیچ، ، ئەو قسە زۆر کاری تێکردم(هەستتان بەرامبەر

بە یەکدی هەیە)، چونکە ئەگەر خوا هەستی بەرامبەر بە یەکدی دروست نەکردایە، ئێستا بارەکە چۆن دەبوو؟ ئەمە رامانێکی قووڵ و راستەوخۆ و دیدێکی خێرایە بۆ سەرەتای دروستبوون و واقیعی راستەقینەی شتەکان... (تۆماس کارلایل: پاڵەوانان و پاڵەوانێکی بەرزراگر).

ئەو دەستەواژەیە (هەستتان بەرامبەر بە یەکدی هەیە) زۆر کاری کردووەتە سەر تۆماس کارلایل، پێم وایە ئەو ئایەتەی وا هەستی جووڵاندووە بریتی بێت لە:

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الروم: ٢١

(وە لە نیشانەکان ئەوە (خوایە) کە بۆی دروست کردوون لە (ڕەگەزی) خۆتان هاوسەرانێك بۆ ئەوەی ئارام بگرن لە لایان دا وە خۆشەویستی و بەزەیی خستۆتە نێوانتان بەڕاستی لەوەدا نیشانانێك هەیە بۆ کەسانێ کە بیر دەکەنەوە.)

ئەم ئایەتە بە زمانی ئینگلیزی چەند واتایەکی کراوە، یەکێکیان هی یووسف عەلیەو دووەم هی قەشەیەکی مەسیحیە بەناوی رودویل و سێیەمیان هی جولەکەیەکی عێراقیە بەناوی داوود، بەڵام بە داخەوە کارلایل هیچکام لەوانەی لەبەردەست نەبووە، تەنها نوسخەیەك لە سەردەمی ئەو لە

ساڵی 1840 دەست دەکەوت ئەوەیە کە لە لاپەڕە هەشتاو پێنجی کتێبەکەیدا باسی کردووەو دەڵێ: (هەروەها دەتوانیت قورئان بخوێنیتەوە و وەرگێڕانی واتاکانیدا کە وەرگێڕ هێناویەتی، تا بزانیت چەندە چاکە).

کارلایل زۆر چاکەی بۆ نەوەکانی وڵاتەکەی ویستووە، جۆرج سیل کە ڕێبەری وەرگێرانی قورئان بوو بۆ زمانی ئینگلیزی و گومانیشی لێی هەبوو. دوژمنایەتی خۆی بۆ کتێبی پیرۆزی موسڵمانان نەشاردووەتەوەو لە پێشەکی وەرگێڕانەکەی لە ساڵی 1374ز.دا راشکاوانە موحەممەد (ﷺ)بە ساختەکار دەزانێت و دەڵێت (کێ دەتوانێت دەست بخاتە سەر مەترسیە ڕوونەکانی ئەم ئایینە؟ پرۆتستانتیەکان تاکە کەسن دەتوانن سەرکەوتوانە هێرش بکەنە سەر قورئان، من دڵنیام پشتیوانی خوا شکۆدارییان لە کەوتن و ڕووخان دەپارێزێت).

بەو مۆرک و دیدەوە دەستی کرد بە وەرگێڕانەکە، ئیتر خۆت بڕیار بدە دەبێت جۆرج سیل چ دادپەروەری و ڕێبازێکی زانستی گرتبێتەبەر بە تایبەت بەرامبەر ئەو ئایەتە کە زۆر کاری کردووەتە سەر کارلایل، ئینجا بەراوردی بکە بەو سێ وەرگێڕانەی تری واتاکانی قورئان کە یەکێکیان موسڵمان و یەکێکیان مەسیحی و ئەوی تریان جوولەکەیە.

﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الروم: ٢١

(وە لە نیشانەکان ئەوە (خوایە) کە بۆی دروست کردوون لە (ڕەگەزی) خۆتان هاوسەرانێك بۆ ئەوەی ئارام بگرن لە لایان دا وە خۆشەویستی و بەزەیی خستۆتە نێوانتان بەڕاستی لەوەدا نیشانانێك هەیە بۆ کەسانێ کە بیر دەکەنەوە.)

بەم پەشتە وەربگێڕارە:

لە موعجیزەکانی تری ئەوەیە کە لە خودی خۆتان هاوسەری بۆ بەدیهێناون تا لەگەڵیان بژین، خۆشەویستی و میهری لەنێوانتاندا داناوە.

بڕوام نیە جۆرج سیل لەو کاتەدا هێندە نێرانە زێدەڕۆ بووبێت کە هاوسەرگیریمان وەك مەسەلەیەکی جنسی بۆ باس بکات، تەنها ویستوویەتی ئەو بەڵێنەی خۆی بباتەسەر کە کارلایل پەی پێ نەبردووە، ئەو وشە عەرەبیەی کە کارلایل گۆڕیویەتی بریتیە لە (لتسکنوا) کە واتای لەگەڵ ژیان ناگەیەنێت بەو واتایەی (هەرکات هاوسەرگیریەکی شەرعی نەبوو ژیانێکی جنسییان لەگەڵ بەرنەسەر).[1]

---

[1] - قاموس الفهم العالمی للقاریء

جا هەر وشەیەکی دەقی قورئانی زۆر بە وردی دانراوەو خوای گەورە بە مەبەست فەرموویەتی، چونکە فەرمایشت و موعجیزەی خوایە.

داوای نیشانەیەك دەكات.

چ نیشانەیەك؟ مەبەستی جۆری تایبەتی نیشانەو موعجیزەیە کە عەقڵی کورتی ئێمە لێی تێگەیشتووە، هەموو شتێ بە ویستی خوا بووەو دەبێت. بەڵام خوا وەڵامی هەموو گەمژەییەکی مرۆڤەکان ناداتەوە یان هەموو داواکاریەکی نارەواو سەرشێوێنییان ناهێنێتەدی، بەڵکو پێغەمبەرانی خۆی ناردووە بە بە ڕوونی موعجیزەکانی روون بکەنەوەو خەڵکی هۆشیار بکەنەوە لە سەرەنجامی لادان، ئایا ئەمە بەس نیە؟ جا بە گشتی داواکاریەکەیان لەمەدا خۆی دەبینێتەوە کە چەند دەستەواژەیەکی دیاریکراو بوون بەرامبەر بە موحەممەد(ﷺ) بەکاریان دەهێنا:

ئادەی پەیژەیەك دابنێ تا سەرکەویت بۆ ئاسمان.

لای خوا کتێبێکمان بۆ بێنە خوارەوە تا بیخوێنینەوە ئینجا باوەڕ دێنین.

ئەو شاخەی دەیبینیت بیکە بە زێڕ ئینجا باوەڕ دێنین.

ئەو بیابانە پڕ بکە لە کانی و رووبار ئینجا بڕوا دێنین.

ئینجا گوێ بگرە لە وەڵامی جوان و ڕوونی موحەممەد(ﷺ) بەرامبەر بەو داواکاریە نامەعقوول و گوماناویانەیان، فەرمووی(ئایا پێتان بڵێم من فریشتەم؟ یان پێتان بڵێم من خاوەنی خەزێنەکانی خوام؟ من تەنها شوێن ئەوە دەکەوم کە بۆم دابەزیوە).

هەروەها گوێ بگرە لەو وەڵامە جوانەی کە خوا فەرمانی کرد پێغەمبەر(ﷺ) بیگەیەنێت بە بێباوەڕان:

﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَـٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ قُلْ إِنَّمَا ٱلْـَٔايَـٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ ﴾ العنكبوت: ٥٠

(وە وتیان ئەوە بۆ چەند موعجیزە و بەڵگەیەك دانابەزێنرێ بۆ سەری (موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) لەلایەن پەروەردگاریەوە بڵێ (پێیان هێنانە خوارەوەی) موعجیزەکان تەنیا لەلایەن خواوەیە وە بەڕاستی من تەنها ترسێنەرێکی ئاشکرام.)

لەو ئایەتەدا پێغەمبەر(ﷺ) پشتی بەستووە بە قورئانی پیرۆز بۆ وەڵامدانەوەی ئەو داخوازی و بیانوانەی هەندێ چینی تایبەت کە داوای موعجیزەو بەڵگەیان دەکرد و بیرێکی پووچی بتپەرستییان هەبوو، بەراستی موعجیزەکان نیشانەن بۆ کەسانی بێباوەڕ و گومانساز و داوخوازیەکەیان تێر دەکات، ئینجا داوایان لێکراوە تەماشایەکی قورئان بکەن:

﴿ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ ﴾ العنكبوت: ٥١

(ئایا بۆ ئەوان بەس نییە کە ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە بۆ سەر تۆ دەخوێنرێتەوە بەسەریاندا بەڕاستی لەم قورئانەدا بەزەیی و پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆ باوەڕداران.)

دوو بەڵگە: وەك بەڵگەیەك تا خوا بیسەلمێنێ کە قورئان لای خواوە هاتووە، خوای گەورە دوو بەڵگەمان پێ دەبەخشێت:

یەکەم: خوای گەورە ئەم قورئانەی دابەزاند بۆ سەر موحەممەد(ﷺ) کە نەخوێندەوار بوو، نە نووسین و نە خوێندنەوەی نەدەزانی، نەیدەتوانی ناوی خۆی بنووسێت و ئیمزا بکات، دەی بزانە تۆماس کارلایل سەبارەت بە توانا زانستیەکانی موحەممەد(ﷺ) چی دەڵێت: بارێکی دی هەیە کە دەبێت لەبیرمان بێت، موحەممەد خوێنەواریەکی رەسمی فێر نەبووبوو، ئەوەی پێی دەڵێین خوێندەواری رەسمی بەهیچ شێوەیەك نەیبووە).

وێڕای ئەوەی سروشی خوایی شایەتی ئەوە دەدات کە موحەممەد (ﷺ) نەیتوانیوە ناوەڕۆکی قورئان بنووسێتەوە، لە قورئاندا هاتووە

﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُواْ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾ العنكبوت: ٤٨

(وە تۆ (ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)) پێش ئەم (قورئانە) هیچ کتێبێکت نەدەخوێندەوە وە بە دەستی ڕاستت نەت نوسیووە (ئەگەر وابوایە) ئەو کاتە ناڕاستەکان (بێ بڕوایان) دەکەوتنە گومانەوە.)

بۆیە خوای گەورە وامان لێدەکات بیر بکەینەوە ئایا موحەممەد کەسێکی خوێندەوار بووە؟ ئایا توانای نووسین و خوێندنەوەی هەبووە؟ لەو کاتەدا بۆ ئەوانەی بازاڕگەرمی دەکەن بۆ گومانەکان و پێیان وایە قورئان فەرمایشتی خوا نیە، ئەگەر بێتو وا دابنێین موحەممەد کەسێکی خوێنەوار بوو بێت، ئەوکات تۆمەتەکانی دوژمنانی ئەوە دەبێت لەوانەیە قورئانی لە نووسینەکانی جوولەکەو مەسیحیەکانەوە وەرگرتبیت یان لەوانەیە نووسینەکانی ئەرستۆ و ئەفلاتوونی خوێندبێتەوە یان تەورات و زەبوور وئینجیلی خوێندووەتەوە و سەرلەنوێ بە زمانێکی پاراو دایڕشتووەتەوە، یان لەوانەیە هەندێکی لەوانە وەرگرتبێت، لەوانەیە ئەمە قسەیەك بێت و لەو

مەسەلەدا فرێ دری، بەڵام ئەم داوە دەدرێتەوە بەرووی ملهوڕان و گاڵتەجاراندا، هەرگیز ناکرێت پشت بەو بەڵگەی ئەوان ببەسترێ.[1]

دووەم:قورئان، بەڵێ خودی قورئان بەڵگەیە کە سروشێکی خواییە، لە هەر لایەکەوە لێکۆڵینەوە لە قورئان بکە، بۆچی رازی نیت بەو تەحەددایەی لە قورئاندا هاتووە ئەگەر گومانەکانت راستن؟

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَـٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ ﴾ النساء: ٨٢

(ئەوە بۆ بیر ناکەنەوە لە قورئان ؟ خۆ ئەگەر لە لایەن کەسێکی ترەوە بوایە جگەلە خوا بێگومان دەیان بینی تیایدا جیاوازی زۆر)

---

[1] - کتێبی پیرۆز لە سەدەی دەیەمی زیانیدا ئینجا وەرگێردرایە سەر زمانی عەرەبی، بۆیە هیچ عەرەبێ نەبووە پێش ساڵی هەزاری زایینی دەرفەتی ئەوەی هەبوویێت کتێبی پیرۆز بە زمانی تایبەتی خۆی بخوێنێتەوە.

پێچەسپاوی:

جێی بڕوا نیە هیچ نووسەرێکی ناو مرۆڤایەتی ماوەی زیاد لە دوو سەدە پێچەسپاو بێت لەسەر ئامۆژگاری و ڕێنماییەکانی، هەر لە تەمەنی چل ساڵیەوە کە یەکەم بانگەوازی خوایی دابەزی تا تەمەنی شەست و سێ ساڵی کە دوا هەناسەکانی ژیانی دەدا، ماوەی بیست و سێ ساڵ پێغەمبەر(ﷺ) پەیامی ئیسلامی بڵاوکردەوە، لەو ماوەدا چەند باری جیاوازی تێپەڕاند، جا چ مرۆڤێ وەك ئەو بارەی پێغەمبەری خوای بەسەردا بهاتایە دەستبەرداری بیروباوەڕی نەدەبوو و وازی نەدەهێنا؟ کەس نیە بتوانێ هەمیشە هەمان شت بنووسێتەوە، قورئانی پیرۆز کە پەیامێکی خواییە لە هەموو کاتەکاندا لەسەر هەمان بنەما و ڕێباز پێچەسپاو بووە، یان ئەو بەرنگاربوونەوانەی ناموسڵمانەکان تەنها مشتومڕ و پەرچەکردار بووە دژ بە ڕووناکی و حوکمە باڵاکانی قورئان؟ زیاد لەوەش، قورئانی پیرۆز چەندین مەسەلەی پەیوەست بە سروشتی بوونی باسکردووە کە پێشتر خەڵك ئەوانەی نەدەزانی؛ بەڵام دوای ئەوەو پاش پێشکەوتن و دۆزینەوە زانستیەکان ئینجا بە تەواوەتی ئەو ڕاستیانە دەرکەوتن، جا عەقڵێ کە ژیری و ڕەوشتی لەگەڵ نەبێ پێشتر گاڵتەو هێرشی خۆی دەکات.

### بەڵگەی ڕوونی دەروونی

جار دوای جار کە لەلایەن دوژمنانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) داوای موعجیزە لە پێغەمبەری خوا دەکرا، ئەویش قورئانی وەك موعجیزە پێ نیشان دەدان، قورئان کە موعجیزەی موعجیزەکانە، دانا و بەرچاوڕوونە ئەدەبی و رۆحیەکان و ئەوانە دڵنیا بوون لە خۆیان قورئانیان لە وتەی تر جیا دەکردەوەو وەك موعجیزەیەکی راستەقینە تەماشایان دەکرد، قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿ بَلْ هُوَ ءَايَـٰتٌۢ بَيِّنَـٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَـٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾ العنكبوت: ٤٩

(نەخێر وانییە گومان دەبەن بەڵکو قورئان نیشانەکانی ئاشکران لە دڵ و دەروونی کەسانێکدایە کە زانستیان پێ دراوە (لەلایەن خواوە) تەنیا ستەمکاران دان نانێن بە نیشانەکانی ئێمەدا)

## باسی دووەم: سروشی قورئانی و زانستەکان:

سەنا و پیاهەڵدان دوور لە حەسوودی

لە جیهانی ئەمڕۆدا نزیکەی یەك ملیارد موسڵمان هەن کە بێ هیچ دوودڵیەك قورئان بە فەرمایشتی خوا و موعجیزەش تەماشا دەکەن، بۆچی تەنانەت دوژمنە راشکاوەکانیش سەنا و ستایشی ئەو کتێبە دەکەن، بۆ نموونە بوسورس سمیس لە کتێبەکەیدا (موحەممەد و موحەممەدیەکان) پێی وایە قورئان لە ئسلووب و دەربڕین و دانای و حەقدا موعجیزەیە.

زانایەکی تری ئینگلیزی هەیە کە ناوی ئەربیریە لە پێشەکی وەرگێڕانی واتاکانی قورئاندا دەڵێت هەرکات گوێم لە قورئان دەبێت، وا دەزانم گوێ لە مۆسیقا و ئاوازێکی خۆش دەگرم، دەنگێ هەیە هەمیشە وەك لێدانی تەپڵ وایە، وەك لێدانی دڵم وایە).

دەبینین لەم قسانەوە کە دەیکات وادەزانیت وەك موسڵمانێ گوێی لێگرتووە، بەڵام بە داخەوە تا وەفاتی کرد موسڵمان نەبوو.

هەروەها بریتۆن مارمادیۆك بەکتول لە پێشەکی وەرگێڕانی واتاکانی قورئاندا دەڵێت: سەمفۆنیایەکی هەمیشەیی هەیە، پیاوان دەبزوێنێ تا فرمیچسك بڕژێن.

ئەمەیان پێش ئەوەی واتاکانی قورئان وەرگێڕێ موسڵمان بوو، ئیتر نازانین ئەم هەستەی پێش موسڵمانبوونیەتی یان دوای موسڵمانبوونی.

ئینجا دواتر –واتە دوای ئینجیل چونکە نووسەرەکە مەسیحیە– کتێبی پیرۆز (قورئان) باڵاترو رێزلێگیراوترەو ئایینەکەش لە جیهاندا بەهێزترە. (ج. کریستی ویلسون: مقدمە الاسلام، نیویورك، 1950).

قورئان کتێبی پیرۆزی موحەممەدیەکانە، لە هەر کتێبێکی تر زیاتر رێزلێگیراوە، زۆر زیاترە لە عەهدی قەدیمی جولەکەو عەهدی جەدیدی مەسیحی. (ج.شدلی: عیسی المسیح فی القران).

دەتوانین بە ئاسانی چەندین دەقی تری وتەی کەسانی تریش بهێنین سەبارەت بە قورئان چ لە دۆست و چ لە دوژمن کە بیچ هیچ ئێرەییەك وەسفی کۆتا سروشی خواییان کردووە کە قورئانی پیرۆزە، کەسانی هاوسەردەمی پێغەمبەریش(ﷺ) جوانی و ناوازەیی بانگەوازەکەو رەسەنایەتی پەیامەکەو نیشانەی موعجیزەی خواییان بینیوەو ئیسلامیان قبووڵکردووە، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، بێباوەڕو گومانسازان ئەوانەیە بڵێن ئەمانە تەنها بڕێ هەستی مەوزووعین، دەی بۆی هەیە بۆ بەڵگەی زیاتر بگەڕێت کە عەرەبیش نازانێت با گوێ بگرێ و ئینجا بڵێ من هەمان ئەو هەستەم نیە کە تۆ هەتە، جا چۆن بزانم خوا زیندووەو ئەوەی بە سروش ناردووە بۆ موحەممەد (ﷺ)؟ من رقم لە جوانی فەلسەفەو رەوشتی زانستی و گەورەییەکەی نیەو

ئامادەم دان بەوەدا بنێم کە موحەممەد کەسێکی دڵسۆز بووەو چەندین بنەمای جوانی لە بەرژەوەندی مرۆڤ پێشکەش کردووە، بەڵام ناتوانم هاوڕای ئەو بانگەشەی تۆی موسڵمان بم کە ئەویش بریتیە لە(پەیوەستکردنی بیروباوەڕەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بە توانای خواییەوە).

مەنتیقی مەعقوول:

هاودەم بەم جۆرە عاتیفەو سۆزە، هێشتا گومانسازانێکی عەقڵگەرا هەن، خوای گەورەش هەموو جۆرە بەڵگەیەکی بەکارهێناوە بۆ نەهێشتنی گومانەکان، بۆ بێباوەڕ و ملهوڕ و گاڵتەجار و گومانسازەو شارەزایانی زانستەکان و ئەوانەی خۆیان بە خاوەنی بیرێکی بەرزی عەقڵی دەزانن، ئەم راستیەیان پێشکەش دەکەین، ئەوانە وەك ئەو قەزەمە وان کە لەوانەیە گەشەیەکی نائاساییان لە ئاراستەیەکدا دەستکەوتبێ کە بەوەش لایەنێکی تریان پشتگوێ خستووە، وەك گەورەبوونی سەر لەسەر حسابی جەستەیەکی لاواز، خوای گەورە ئەو کەسانە تاقی دەکاتەوە.

بەڵام پێش ئەوەی پرسیارەکەی خوا بخەینەڕوو، رێ بدەن قسەیەك بکەم(بۆ پیاوە زاناکانتان و ئەوانەی شارەزای زانستی گەردووونناسین، ئەوانەی لەرێی تەلەسکۆبە گەورەکانتانەوە توێژینەوە لەم کەونە دەکەن، پێم

بلێین ئەم گەردوونە چۆن دەستی پێکرد؟ ئەم جۆرە کەسە هەرچەندە ناتوانێت دیدی ڕۆحی هەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر سەخاوەتی هەیە ت کەسانی تر لە زانستەکەیدا بەشداری پێ بکات و ئامادەیە وەڵام بداتەوە باشە، ئینجا دەست پێ دەکات: تەقینەوەیەکی گەورە لە نێو کوتلەی گەورەی ماددەدا ڕوویدا و ڕێژەیەکی گەورەی ماددە بە هەموو ئاراستەیەك دەڕۆیشت، لەو تەقینەوە گەورەوە سیستمی خۆری ئێمە و کاکێشانەکان دەرکەوتن، لەو کاتەوە بەرنگاریەك لە فەزادا دژ بەو هێزە پاڵنەرەی ئەو تەقینەوە ناوخۆییە بوونی نیە، ئیتر ئەستێرەو هەسارەکان بوونە شەبەحی ڕێرەوەکە...)

جا لەم نێوەندەدا قسەیەکی خۆشم هەیە بۆتان، وا دەردەکەوێت هاوڕێ ماددیگەراکانمان بە نهێنی زانستەکەی خۆیان لە سوورەتی یاسین وەرگرتبێت کە خوا دەفەرموێت:

﴿ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ ﴿٣٩﴾ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾ يس: ٣٨ ـ ٤٠

(خۆریش بەرەو بنکەی خۆی (لە گەڕاندایەو) دەڕوا ئەوە بڕیار دراوی (خوای) زاڵی زانایە، وە بۆ مانگیش چەند قۆناغێکمان داناوە (دوای تەواو کردنی قۆناغەکانی) هەتا وەکو لقی دار خورمای کۆنی (ووشك بووی) لیٚ دێت، خۆر بۆی نی یە (ناتوانیٚ) بگات بە مانگ و شەویش ناتوانیٚ پێشکەویٚ لەڕۆژو هەریەکەیان (خۆرو مانگ) لە خولگەیەکدا مەلە دەکەن ودەسوڕێنەوە)

زانای ملهوڕ قسەکانی تەواو دەکات و دەڵێت: ئەم گەردوونەمان فراوان دەبێت و کاکێشانەکان زۆر خێراتر لێمان دووردەکەونەوە، ئیتر کە دەگەنە خێرایی تیشك دوای ئەوە ناتوانین بیانبینین، پێویستە بە خێراترین کات تەلەسکۆبێکی گەورەتر و باشتر دروست بکەین تا بتوانین ئەو دیمەنانە بخەینە بەر باس و توێژینەوە، ئەمە ئەگەر دوانەکەوین.

جا کەی ئەم پیرۆکە خەیاڵیانە ئاشکرا دەکەیت؟ دەپرسین: نا، وەك تۆ دەڵێیت ئەمانە چیرۆکی خەیاڵی نین و راستی زانستین، بەڵام کەی راستی گەیشت بەم راستیانە؟ (تەنها دوێنیٚ شەو) ئەمە وەڵامی دەبێت، جا لە مێژووی مرۆڤایەتیدا پەنجا ساڵ لەمەوپێش بە دوێنیٚ شەو ناو دەبرێت.

عەرەبە نەخوێندەوارەکانی ناو بیابان هەزارو چوارسەد ساڵ لەمەوبەر ئەم زانستەی تۆیان نەدەزانی کە تەقینەوەی گەورە روویداوەو گەردوون هەیە، ئایا دەیانتوانی ئەم زانستەی تۆیان هەبێت؟ هەمان پرسیار دەکەین و ئەویش بیٚ هیچ دوودڵیەك دەڵێت نەخێر شتی وا قەت نابێت، باشە، دەی

گوێ بگرە لەم ئایەتەی قورئان کە پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار بۆی دابەزیوەو دەیخوێنێتەوە:

﴿ أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الأنبياء: ٣٠

(ئایا نەیان دی (نەیان زانیوە) ئەوانە بێ بڕوا بوون کە ئاسمانەکان و زەوی هەردووکیان پێکەوە لکابوو (یەك پارچە بوون) ئینجا لە یەکترمان جیاکردنەوە وە فەراهەممان هێنا لە ئاو هەموو شتێکی زیندوو دەی ئایا ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن؟)

﴿ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ ۖ كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ الأنبياء: ٣٣

(وە هەر ئەو (خوا) یە کە شەوو ڕۆژی دروستکردووە وە خۆرو مانگیش (ی دروست کردووە) هەریەك لەوان لە خولگەیەکدا دەسوڕێنەوە.)

### بیردۆزەی تەقینەوە گەورەکە:

دەتوانیت وابڕوانیت ئەو وشانەی بێباوەڕان کە پێشتر باسمان کردن رووبەڕووی تۆ کراونەتەوە، پیاوانی زانست چ لە جوگرافی و گەردووناسەکان کە برێ دۆزینەوەی سەرسوڕهێنەریان بەدیهێناوەو ئەو دۆزینەوانەیان گەیاندووە بە مرۆڤایەتی، بەڵام هێشتا نابینان، چونکە بەدیهێنەری هەموو ئەو شتانە نابینن.

(بە زانیاری و شارەزایی ئێمە گونجاوە بۆمان سەرچاوەی خوایی لەو هەڵسوکەوتەماندا لەبیر بکەین؟) (تۆماس کارلایل).

جا چۆن کەسێ لە بیاباندا لەسەر وشترێ چواردە سەدە پێش ئێستا توانی راستیەکانی ئێوە بزانێت، ئەگەر بەدیهێنەری تەقینەوە گەورەکە خۆی هەواڵی پێ نەدابێت؟

### بنەرەتی ژیان:

ئێوەی بیۆلۆجی کە لە هەموو ژیانی ئەندامیدا چەند پەنجەیەکتان لێ دەرکەوتووە، هێشتا ناتوانن دان بنێن بە سەرچاوەی ژیاندا کە خوای گەورەیە، دەی پێم بڵێن بەپێی توێژینەوەی خۆیتان: لەکوێ و چۆن ژیان پەیدا بوو؟

وەك هاوڕێ گەردوونناسەکەی کە ڕۆچووە لە زانستدا دەڵێت باشە پێت دەڵێم، پێش بلیۆنەها ساڵ ماددەی سەرەتایی لە دەریادا پرۆتۆپلازمای بەرهەم هێنا و لەوێوە ئەمیبای لێ دەرکەوت، لەمەوە هەموو شتە زیندووەکان دەرکەوتن.

بە دەستەواژەیەکی تر واتە هەموو زیندەوەرەکان لە دەریا واتە ئاوەوە هاتون.

ئەی ئێوە کەی ئەم ڕاستیەتان ئاشکرا کرد کە هەموو زیندەوەرەکان لە ئاوەوە هاتون؟ لە وەڵامدا دەڵێت زۆر دوور نەبووە، دوێنێ بوو.

ئەی ئایا زانایەك یان فەیلەسووفێ یان شلاعیرێ پێش چواردە سەدە پێشبینی ئەم دۆزینەوە بیۆلۆجیەی کردبێت چۆنە؟ ئەمیش خێرا دەڵێت: نا شتی وا نابێت.

دەی باشە، گوێ بگرە لە نەخوێندەوارەکەی بیابان بزانە چی پێیە:

﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾﴾ الأنبياء: ٣٠

بۆ وردەکاری زیاتر لەو بارەوە بڕوانە ئەم ئایەتە:

﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٍ مِّن مَّآءٍ فَمِنْهُم مَّن يَمْشِى عَلَىٰ بَطْنِهِۦ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِى عَلَىٰ رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِى عَلَىٰٓ أَرْبَعٍ يَخْلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤٥﴾ ﴾ النور: ٤٥

(وە خوا هەموو زیندەوەرێکی لە ئاو دروستکردووە ئینجا هەندێ لەوانە لەسەر سکی دەڕوات وە هەندێکی تریان لەسەر دوو قاچ دەڕوات وە هەشیانە لەسەر چوار پێ دەڕوات خوا هەرچی بوێ دروستی دەکات بێگومان خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.)

سەخت نیە تێبینی ئەوە بکەیت ئەو وشانە لە بەدیهێنەری گەردوونەوەن، ئەو خوایەی توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو ئاگادارە بە هەموو شتێك، ئەمە ئاراستەیە بە ئێوەی پیاوانی زانست کە وەڵامی گومانەکانی ئەمڕۆتان دەداتەوە، ئەو واتا راستەقینە چواردە سەدە لەمەوپێش لەنێو دانیشتوانی بیاباندا خراوەتەڕوو، خوای گەورە ئەو بەڵگانە دەخاتەڕوو بۆ ئێوەی زانستخوازان، جا چۆن ناتوانن بڕوا بهێنن بە خوا؟ دەبوو ئێوە کۆتا کەس بن لە نکووڵی خوادا، کەچی بوونەتە سوورەی بەر لەشکری بێباوەڕی.

چ دەردێکتان تووش بووە تا هەست نەکەن بەو راستیە؟ زانایانی زانستی پەیوەست بە دارودرەخت و ئاژەڵ و فیزیاناسەکان هەرچەندە سەرسامی دیمەنە سروشتیەکانن، کەچی ئامادە نین دان بنێن بە خوای

بەدیهێنەردا، دەی رێ بدەن با ئەوان خۆیان ئەم دەقە قورئانیە شرۆڤە بکەن (سبحان الڑی خلق الازواج...لا یعلمون) (یس: 26).

بەدیهێنانی رەگەزەکان

نهێنی رێکردەی رەگەز لەنێو هەموو دروستکراوەکاندا، لە مرۆڤ و ژیانی ئاژەڵ و سەوزەوات و هەر شتێکی تردا کە نایزانین، ئەوەیە کە رەگەزی جیایان هەیە بۆ هێزی رەنگدانەوەی ناو سروشت، وەك مووجەب و سالب لە کارەبادا..هتد.

خودی ناوك لە چەند تۆوی هەلگری مووجەب یان پرۆتۆن و چواردەور دراو بە ئەلکترۆنی هەلگری سالب پێکدێ، ئەمەش پێکهاتەی خودی ماددەیە، سەرچاوەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هەردوو رەگەزی هەیە تا وزە پێچەوانەکانی تێدا بێت. (یووسف عەلی).

ئایەتەکانی ئەو کتێبە روونە کە قورئانی پیرۆزە بە روونی راڤەی خۆیان دەکەن، ئەوانەی لە قورئان دەکۆڵنەوە لە هەر دۆزینەوەیەکی مرۆییدا دەستی توانای پەروەردگار بەدی دەکەن، ئەو نیشانە یان موعجیزانەی خواش بۆ نەهێشتنی گومان و بەهێزکردنی ئیمانە، خوا دەفەرموێت:

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ ﴿٢٢﴾﴾ الروم: ٢٢

چ گاڵتەجاڕیەکە هەوادارانی زانست خۆیان گومانیان هەبێت لە حەقیقەت، زانستە ماددیە فراوانەکەیان تووشی بەخۆدانازینی کردون، ئیتر ئەو هەڵکەوتەییە مرۆییەیان نیە بەرەو زانستی حەقیان ببات.

لە وتەیەکی کابرایەکی فەرەنسی سەردەمدا دەبینین ئەو ئەگەر تایبەتیەی سەرەوە وا نیشان دەدات ئەگەرەکانی ئەوانەی وا دەزانن موحەممەد نووسەری قورئانە نەگونجاون، چۆن کەسێکی نەخوێندەوار دەتوانێت ببێتە ئەو نووسەرە زۆر گرنگە، بە دەستەواژەیەکی جوانی ئەدەبی ئەو قورئانە بنووسێت و زاڵ بێت بەسەر هەموو ئەدەبی عەرەبیدا؟ چۆن توانی بە سروشتێکی زانستی وا قسە بکات کە کەس لەم سەردەمەدا پێی بکات، بێ ئەوەی یەك هەڵەی بچووکیش بکات.

لە سەرەتای ئەم نووسینەوە (قورئان موعجیزەی موعجیزەکان) لە ڕێی باڵوێزی ئیسلام و وتاربێژی ڕەوانبێژ مەولانا عەبدولعەلیم صدیقیەوە بوو، من تەنها خوێندکاری خوێندنگە بووم کاتێك ئەو لە سەردانێکیدا لە ساڵی 1934ز. سەردانی باشووری ئەفریقیای کرد، لەنێو قسە بەناوبانگەکانیدا بابەتێکی پێشکەش کرد(گرنگیدانی موسڵمانان بە زانست)، دواتر نامیلکەیەك بە هەمان ناونیشان چاپ کراو یەکێتی جیهانی دەستەی نێردە ئیسلامیەکان

لە کەراتشی لە پاکستان چاپی کردبوو، ئیتر تامی خۆشی وتارەکەی سەردەمی منداڵی پێبەخشیمەوە، لە یادەوەری ئەو خزمەتکارە گەورەی ئیسلامدا لێرەو بۆ نەوەکانی داهاتووش چەند وتەیەکی مەولانا دەخەمەروو سەبارەت بە پەیوەندی نێوان قورئان و لقەکانی زانستی مەعریفی.

## هاندان بۆ زانست

قورئانی پیرۆز لە دیاردەیەکی ناوازەی ئایینیدا خەڵکی لەسەر ئاستی جیهان هان دەدات بۆ شارەزابوون لە زانستی گەردوون، بەردەوام راماندەچڵەکێنێ بۆ رووکاری سروشتی دەوروبەرمان، بەردەوام موسڵمانان هان دەدات تا رۆبچن لە زانستی مەعریفیدا، ئەوەش ئەرکێکی ئایینیە، بەردەوام جەخت دەکاتەوە لەو راستەقینە گەورەی کە جیهان نایزانن و لە قورئاندا هاتووە، ئەویش ئەوەیە هەموو شتێ لە سورشتدا لە خزمەتی مرۆڤدایەو دەبێت بۆ خزمەتی مرۆڤ بێت و بەکاری بهێنێت، هانمان دەدات لێکۆڵینەوە بکەین لە پێکهاتەو ئەرکی جیهانی زیندوو و ئەرك و ریزبەندی و دابەشکاری گژوگیان و دارودرەختەکان، ئەمەش کێشەی زانستی زیندەوەرزانیە، هانمان دەدات لێکۆڵینەوە بکەین لە سیستمی سروشت و تایبەتمەندیە گشتیەکانی ماددەی کاریگەر بە وزە کە ئەمەش کێشەی فیزیای نوێیە،

هانمان دەدات لێکۆڵینەوە بکەین لە تایبەتمەندیەکانی ماددەی تێکەڵ و یاساکانی تێکەڵبوون و کارلێکی نێوانیان کە ئەمەش کێشەی کیمیای نوێیە،

هانمان دەدات لێکۆڵینەوە بکەین لە پێکهاتەو بنەرەتی کانزایی زەوی و چینە جیاکانی و ئەو گۆڕانانەی لە ماددە ئەنامی و نائەندامیەکانی و ..هتددا ڕوودەدات کە ئەمەش کێشەی زانستی زیندەزانی نوێیە،

هانمان دەدات لێکۆڵینەوە بکەین لە وەسفی گشتی زەوی و دابەشکاریە فیزیاییەکانی ناو دەریا و ڕووبار و شاخ و دەشت و..هتد و کانزا و دارودرەخت و کانزاکانی هەرکامیان و بەشە سیاسیەکانی کە کێشەی زانستی جوگرافیای نوێیە،

هانمان دەدات لەسەر لێکۆڵینەوە لە هۆکارەکانی هاتنی شەو و ڕۆژ و جیاوازی وەرزەکان و جووڵەکی هەسارەو دیاردەکانی تری ئاسمان کە ئەمەش کێشەی زانستی گەردوونناسی نوێیە،

هانمان دەدات بۆ لێکۆڵینەوە لە جووڵەی با و پێکهاتن و جووڵەی هەورەکان و درووستبوونی باران و دیاردە هاوشێوەکانی تر کە ئەمەش کێشەی زانستی پێوانەی نوێیە

چەند سەدەیەك موسڵمانان لە بواری زانستەکاندا ڕێبەرایەتی جیهانیان دەکرد، بەرە بەرە سەرکردایەتییان لەدەستدا نەما و موسڵمانان نەیانتوانی

ڕۆڵی سەرکردایەتی خۆیان بگێڕن و ماددیگەرایی ئەورووپی پێشڕەوی کرد و ئە وبۆشاییە سەرکردایەتیەی پڕکردەوە کە موسڵمانان دایانهێنا، وێڕای ئەمەش مەولانا ئەم بەشداریانەی موسڵمانان دەخاتەڕوو:

ئەو شۆڕشەی ئیسلام دایهێنا زۆر گەورە بوو، چی جۆرێکی زانست هەیە زانایانی موسڵمان تاویان دایە و جێ>ەستی خۆیان تێدا جێهێشت،

لە ڕاستیدا ئیسلام داوا لە کۆمەڵگەی موسڵمانان دەکات کۆمەڵگەیەکی بیریار و ژیاری و شارەزای زانستەکان بن لە هەموو بوارەکانی فێرکاریدا، ئەمانەش ئامانجی بنەڕەتی ئیسلامن، ئەگەر موسڵمانان ئەمەیان نەکردایە، ئەوە ئەورووپا هەرگیز ڕێی ڕێنیسانس و سەردەمی زانستی نوێیان بەدی نەدەکرد.

ئەو گەلانەی ئەورووپا کە مەعریفەیی زانستیان وەرگرت لە ڕاستیدا خوێندکاری ناراستەوخۆی کۆمەڵگەی موسڵمانان بوون لە ڕابردوودا، مرۆڤایەتی قەرزاری ئیسلامە، قەرزێ کە ناتوانێ بیداتەوە، فەزڵ و گەورەیی کۆمەڵگەی ئیسلامی هی لەبیرکردن نیە.

کۆتا وتەی ناوازەو دارێژراوی مەولانا سەبارەت بە بابەتەکەی(گرنگیدانی موسڵمانان بە زانست) بەم وشانەیە: (پێش ئەوەی کۆتایی پێ بێنم، ڕێ بدەن جارێکی تر جەخت لەوە بکەمەوە کۆمەڵگەی

موسڵمان لەمڕۆدا لە ئاکاری ئیسلامی دەرچووە، ئەو ئاکارە ئیسلامیەی کە ریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سروشی خوایی، تەنها ئیمان و پەیڕەوی ئیسلامە دەتوانێت تایبەتمەندی موسڵمان بخاتەڕوو، ئیسلام واجبێکی ئایینی بۆ موسڵمان داناوە کە ئەویش بیرکردنەوەیە لە راستی شتەکان تا لەوێوە بەرەو بیرکردنەوەی زانستی بچێت تا پەروەردگاری بناسێت، بیرکردنەوەی زانستی لە ئیسلامدا کۆتایی نیە، بەڵکو پێناوی گەیشتنە بە ئامانجی باڵا کە ئەویش کۆتایی حەقیقەتی مرۆییە ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴿١٥٦﴾﴾ البقرة: ١٥٦

شەرەفمەند بووم لە ساڵی 1934ز. لە زمانی خودی مامۆستاوە گوێ لەو وتارەی پێشوو بگرم، لە سی ساڵی پێشوودا لە شێوەی کتێبێکدا ئەو وتانەم دەستکەوتەوە، بە هەندێ گۆڕانکاری و زیادەکاریەوە لەبەرم کرد، لەکاتێ:دا لە دوکانی موسڵمانێ لە وێستگەی (بعثة آدم) کارم دەکرد و زۆر بەکەفوکوڵ بووم، لەگەڵ کۆلێژەکە هەوڵمدا تا سەبارەت بە هەمان بابەت وانەیەك پێشکەش بکەم بە خوێندکاران، ئەوکات زۆر گرنگی ئەرکەکەمم نەدەزانی، بەڵام نەمدەزانیئایا خاوەن کارە موسڵمانەکە یارمەتیم دەدات یان نا.

بەڵام هەڕەشی لێکردم ئەگەر ئەو کۆڕە گشتیەم هەڵنەوەشێنمەوە ئەوە لە کارەکەم دەرمدەکات، منیش وردبوومەوە و زانیم بە دڵنیاییەوە کابرای خاوەن کار بێئاگایە لەو هەڕەشە خواییەی کە هەیە، زانیشم ئەگەر نەچم

بەدەم ئەو بێدارکردنەوە قورئانیەوە ئەوە رێی حەقم نەگرتووە (قل إن كان اباؤكم و أبناوكم... القوم الفاسقين) (التوبە: 24).

سوپاس بۆ برا دوودڵەکەمان، یەکەم کۆڕم بۆ موژدەبەرە مەسیحی و قەشە شارەزاکان بوو، منیش بە وردی بابەتەکەم ئامادە کردبوو و جوان لەبەرم کردو خۆم لەسەر راهێنابوو، هیچ کێشەیەکم نەهاتەڕێ، بەدوای ئەوەدا دەساڵ پیشەم قسەو وتەی گشتی بوو، ملیۆنەها کەس وەك سەرۆکە موسڵمانەکەی من کە گرنگیدانیان بە کاروبارە دنیاییەکانەو لە ئایەتەکەی پێشوودا باسیان کراوە و پەیامی ئیسلام ناگەیەنن، بەڵکو بەربەستی بەردەم هەوڵەکانیش دروست دەکەن، کەچی ئەو هەڵسوکەوتەیان بە ئەوپەڕی لەخواترسی وەسف دەکەن، هیچ سوودێکی نیە چونکە خوا بە دەرچوون و فیسق ناوی بردووە.

لەو وتەی پێشوودا مەولانا سەرنجی راکێشاین بۆ قورئانی پیرۆزو هانی دەداین رامێنین لە زانستی زیندەزانی و فیزیا و کیمایا و زەویناسی و زانستی قیسا و ...هتد، زانایانێکی وەك مۆریس بوسیل و کیس مۆر و شێخ زەنەدانی لە چەند بوارێکی زانستی جیاجیادا نووسینیان هەیە کە قورئانی گرنگی پێداوە، بەڵام ناکرێت بوارەکە بەرتەسك بکرێ، قورئانی پیرۆز پڕە لە مەعریفە، پێویستە زانایانی موسڵمانی تایبەتمەندی زانستەکان لەم جیهانەدا بچنە ناو ئەو تەحەددایە کە مەولانا لە نیوەی سیەکانی سەدەی بیستەمدا

باسی کردووە، ئەوان نەچوونەتە هەموو بوارێ، با هەرکامەو لە تایبەتمەندی خۆیدا کار بکات، گەنجانی ئیسلام تینووی زانیاری و کەرەستەن، پەیوەستکردنێکی ساکار لە دیدە زانستیە جیاجیاکانەوە بەسە تا خەمەکەیان بخاتەکار، ئیتر ئەوکات پشت بەخوا مەوسووعەکانیش فریایان ناکەون.

پۆزشم ناهێنمەوە کە مۆڵەتم لە زانایانی موسڵمان وەرنەگرتووە لە خستنەڕووی زانستەکانی قورئاند، تەنانەت پێویستە ناموسڵمانانیش هان بدرێن بۆ دۆزینەوەی قووڵاییەکانی حیکمەتی ناو قورئان، من لەلایەن خۆمەوە وەك کەسێکی ئاسایی بەشدارتان دەکەم لە سروشتی قورئاندا کە وەك برێ ڕاستی ساکار و باو دێتەبەرچاوم.

# باسی سێیەم: قورئان زۆر ناوازە نووسراوەتەوە

لەنێو کتێبەکانی ئایینەکانی ئەم جیهانەدا، قورئانی پیرۆز زۆر جیاواز و ناوازەیە، لەرووی نووسینەوەو پاراستنیەوە موعجیزەیەکە، چونکە جیاوازە لە سیستمی ئاسایی مرۆیی لە چیرۆکدا، دیمەنە کورت و وتە دووبارەوپەیوەست و پێکەوە گونجاوەکان و ئەو دیزاینەی هەیەتی زۆر جیاوازە، ناوازەو موعجیزەشە، ڕێ بدەن بەڵگە بهێنمەوە بۆ وتەکەم:

ئسلوبی مرۆیی:

هەموو کتێبە ئایینیەکانی تر لە دیزایندا بەم جۆرە سنووردار کراون(لە دێر زەمانەوە) یان (ڕێوی و ترێ...گورگ و حەمل) یان چەندینی تری لەم چەشنە:

(لە سەرەتاوە(لە دێر زەمانەوە) خوای گەورە ئاسمانەکان[1] و زەوی دروست کرد) (سیفری تەکوین: 1:1).

لە سەرەتاوە (لە کۆن زەمانەوە) وشە هەبوو، وشەش لای خوا بوو...[1] (یووحەننا: 1:1).

---

[1] - لە دێری یەکەمی کتێبی پیرۆزدا زەوی و ئاسمانیش بە تاك هاتووە، بەڵام لە قورئاندا زەوی بە تاك و ئاسمان بە کۆ هاتووە و بە ئاسمانەکان باسکراوە، ئەمەش پێویستی بە رامانە.

کتێبی لەدایکبوون(بنەرەت، سەرەتا)ی یەسووعی مەسیح، کوڕی داوود کوڕی ئیبراهیم... (مەتا 1:1).

دوای مردنی یەشووع(لە دێ زەمانەوە وابووە) بەنوئیسرائیل داوایان کرد لە پەروەردگار..(القضاة 1:1).

(هەر لە دێرزەمانەوە وابووە) لە سەردەمی حوکمڕانی دادوەراندا برسێتیەك لە سەرزەویدا روویدا.. (راعوپ 1:1).[2]

(لە دێر زەمانەوە) وابووە کەسێك لە رامتایم صۆفیم لە کێوی ئەفرایم هەبوو... (صەمویل 1:1).[3]

(هەر لەدێر زەمانەوە وابووە) دوای مردنی شاول... (صەمویل 1:1).

---

[1] - لە دەستنووسە ئیغریقیە رەسەنەکانی عەهدی جەدیددا وشەیەکی تێدا نیە بە پیتێکی بچووك یان گەورە دەست پێ بکات، زانایانی مەسیحی بەپێی مۆرکی تایینی خۆیان لەکاتی وەرگێڕانی کتێبی پیرۆزدا ئەو پیتانەیان داهێنان، لەوانەیە سەرەتای پیتێ چەمکی خوا بگۆڕێت بۆ چەند خوایەك.

[2] - نووسەری ئەم سیفرە نەناسراوە، لەوانەیە صەمۆئیل بێت، بەڵام بە دڵنیاییەوە خوا نیە.

[3] - ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەو نوسەرانەی نوسخەی پوختکراویان داناوە سەرچاوەی بە سیفری دادوەران دەڵێن لەوانەیە صەمۆئیل بێت، بۆ سیفری راعووسیش دەڵێن لەوانەیە صەموئیل بێت، بەڵام کاتێك دێنە خودی سیفری صەمۆئیل دەڵێن نووسەرەکەی نادیارە.

(لە دێر زەمانەوە وا روویدا) پاشا داوود هەستی بە سەرما دەکرد و دانی –لەسەرمادا– دەیدا لەیەك، بە جلوبەرگ دایانپۆشی کەچی هەستی بە گەرمبوونەوە نەکرد. (الملوك 1:1).

(لەدێر زەمانەوە وابووە) لە سەرەتای ساڵی پاشای فارس کۆرش... (سیفری عەزرا 1:1).[1]

(لە دێر زەمانەوە وا روویداوە) لە رۆژانی ئەحشویروشدا... (استر 1:1).

(لە دێر زەمانەوە وابووە) لە ساڵی سی لە مانگی چوارەم لە رۆژی پێنجەمی مانگدا... (حیزقیال 1:1).

ئەگەر ئەم نموونانە نەیانجووڵاندویت، ئیتر هیچی تر روونادات، تۆ بە شێوازێکی کۆن هێرش دەکەیتە سەر (لە دێر زەمان روویداوە) ئەمە دەڵێیت کەسێکەو چیرۆك دەگێرێتەوە، جا ئەگەر ئەوانە راستیش بن، ئەوە ئسلوب و رێکخستن و چیرۆکەکانن کە من قسەیان لەسەر دەکەم، مرۆڤەکان بەو شێوازە بیردەکەنەوەو قسە دەکەن و دەنووسن، هیچ لۆمەیەکیان لەسەر نیە ونکە مرۆڤەکان هەر بە مرۆڤی دەمێننەوە!

---

[1] - جارێکی تر بێشەرمانە دان بەوەدا دەنێن کە لەوانەیە لەرێی عەزراوە نووسرابێتەوە، جا بڕوانە ئاگاداریە لێکچووەکانیان: لەوانەیە بگونجێ، لەوانەیە...

هه‌موو سه‌رچاوه‌كانی پێشووی نوسخه‌ی مه‌لیك جیمس كه له‌نێو مه‌سیحیه‌كاندا جه‌ماوه‌ریتره، تێبینی ده‌كه‌یت له هه‌ر دێڕیك له‌وانه‌ی پێشوو هێناومانه له سه‌ره‌تاوه هاتوون (1:1) واته یه‌كه‌م ئیصحاح و یه‌كه‌م دێڕی هه‌موو كتێبی پیرۆز، جا خۆت ورد به‌ره‌وه بزانه له سه‌ره‌تای (كتێبی كتێبه‌كان) (كتێبی پیرۆز)ه‌وه چه‌ند جار ئه‌و سه‌ره‌تایانه به‌دیده‌كه‌یت، هاوكات پێویسته ئاگادارت بكه‌مه‌وه له‌وه‌ی كتێبه پیرۆزه‌كه‌ی تۆ كه پێڕستی ئه‌بجه‌دی بۆ دانراوه هاوكارت نابێت، پێویسته خۆت لاپه‌ڕه به لاپه‌ڕه بگه‌ڕێیت به‌ناو كتێبی پیرۆزدا، وه‌ك چۆن من وامكرد.

پێڕستی ئه‌بجه‌دی هاوكارت نابێت:

به وردی ته‌ماشای دوو پێڕستی دوو كتێبی پیرۆزم كرد، یه‌كێكیان له‌ری (شه‌هیدانی خوا) وه چاپ كراوه كه ده‌سته‌یه‌كی مه‌سیحی زۆر بڵاو و گه‌شه‌سه‌ندووی ناو جیهانی مه‌سیحین، دووه‌میش بریتی بوو له (شیكاری ورد بۆ پێرستی كتێبی ئه‌بجه‌دی كتێبی پیرۆز) ، هه‌ردووكیان شانازییان به‌وه‌وه كردووه كه سێ سه‌د هه‌زار مادده له‌خۆده‌گرن، پێڕستی دووه‌م نزیكه‌ی 227 لیستی نوێی له‌خۆده‌گرت، به‌ڵام له یه‌ك دانه‌یاندا ئه‌م چه‌مكه‌م نه‌بینی (له دێر زه‌مانه‌وه وابووه–روویداوه–) له‌كاتێكدا ئه‌و هه‌موو نموونه‌ی پێشوومان هه‌ن كه خستنمانه‌ڕوو، ئێستا ده‌كرێت هۆكاره‌كه‌ی بزانیت.

جا نامەوێت زیاتر راتگرم و دەزانم دەتەوێت بڵێیت باشە ئادەی باسی سروشی قورئانەکەی تۆمان بۆ بکە:

(لە شەوی بیست و حەوتی رەمەزاندا پێغەمبەری خوا موحەممەد(ﷺ) لە ئەشکەوتی حەرائدا بوو لە دەوروبەری شاری مەککە، ئەو راهاتبوو لەوێ کەنار بگرێ تا چێژ وەربگرێ لە ئارامی و هێوری و رامان، ئەو دەیویست خەمی کێشەکانی هۆزەکەی لەئەستۆ بگرێت، نەزانییان، زیناکاری و بتپرەسیت و جەنگ و ستەم و دڕندەییان، مامۆستا جیبۆن چەندە ناچار کرابوو تا ئەمە لە کتێبەکەی خۆیدا (راگەیاندن و رووخانی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی) تۆمار بکات.

(خەڵکی دڕەندە(عەرەب) هەستیان نەمابوو، نەدەکرا ئاسان لە ئاژەڵەکانی تر جیابکرێنەوە).

بە کەنار گرتن لە ئەشکەوتی حەرائدا تامەزرۆی چارەسەرێك بوو، زۆرجار بە تەنها لەو پەناگەیدا کەناری دەگرت، بەڵام جار هەبوو لە گەڵ هاوسەرە ئازیزەکەیدا دایکی باوەڕداران خەدیجە دەمایەوە.

یەکەم بانگەواز:

لە شەوێکدا کە شەوی قەدر بوو، ئارامشی خوای گەورە هەموانی گرتەوە، لە نیوەی ئەو شەوەدا کتێبی خوا لەبەردەم گیانی تینوودا کرایەوە،

ئەوەبوو جیبریلی فریشتەی خوا لەلای دەرکەوت و بە دەستەواژەی بخوێنە فەرمانی پێکرد، موحەممەدیش تەواو شڵەژا بوو و ئامادەی ئەو بارە کتوپڕە نەبوو، چونکە ئەوە ئاهەنگی دەرچوون نەبوو بە جلوبەرگی تایبەتی دەرچوونەوە، لەو بارەدا هاواری کرد من خوێنەوار نیم، جیبریل جاری دووەم دووبارەی کردەوە بخوێنە، موحەممەدیش (ﷺ) هەمان وەڵامی دایەوە. ئەوەبوو جیبریل بە توندی باوەشی پیاکرد و جاری سێیەم وا فەرمانەکەی پێگەیاند ﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾ ﴾ العلق: ١

ئێستا موحەممەد (ﷺ) زانی داوای چی لێکراوە، بۆیە ئەوەی دەوترا دووبارەی دەکردەوە، وشەی اقرأ و ئایەتەکانی دواتری کە لە سوورەتی عەلەقدا هاتون، چوار ئایەت وەك یەکەم بانگەواز بۆ موحەممەد دەخوێنرانەوە.

(راوەستە بەڕێز دیدات، من دەتوانم لە هاوارت تێبگەم، لە هەموو ئەمانەدا سروشی قورئانی پێمان دەڵێت کە ئەمیش لە نموونەکانی تر جیاواز نیەو دەبێت تۆ ئەوە بسەلمێنیت کە ئەمەیان دەستکردی مرۆڤ نیە).

من تەواو بەختەوەرم کە تۆ بە روونی دەبینیت عەقڵی وریای کەسێك چۆن بیردەکاتەوە و دەدوێ و دەنووسێت، لەو کاتەوە (بێزەحمەت بەسەرهاتی خۆت لەگەڵ سروشە قورئانیەکەت بخەڕوو بۆمان) منیش وەڵامم

دایه‌وه (شه‌وی بیست و حه‌وتی ره‌مه‌زان) تا (که له قورئاندا تۆمار کراوه) هه‌موو ئه‌م قسانه‌م له قورئان و کتێبه ته‌قلیدیه‌کان و مێژوو و زمانی مامۆستایانه‌وه وه‌رگرتووه که چه‌ند ده‌یه‌یه گوێیان لێده‌گرم، قورئان ده‌ستی مرۆڤی به‌رنه‌که‌وتووه، ئیتر وا لام خه‌زن بووه، له خواره‌وه پێنج ئایه‌تی یه‌که‌می یه‌که‌م سروشی دابه‌زیو بۆ سه‌ر موحه‌ممه‌د(ﷺ) ده‌خه‌مه ڕوو تا به دیدێکی ره‌خنه‌یی لێی رامێنیت:

﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ﴿٣﴾ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ﴿٥﴾ ﴾ العلق: ١ - ٥

(ئه‌ی موحه‌ممه‌د(صلى الله عليه وسلم) بخوێنه به ناوی په‌روه‌ردگارته‌وه که هه‌موو شتێکی دروست کردووه، مرۆڤی دروست کردوه له خوێنێکی به‌ستوو، بخوێنه، په‌روه‌ردگاری تۆ(له هه‌موو که‌س)به‌خشده‌تره، ئه‌وه‌ی که(مرۆڤی) فێر(ی نووسین) کردووه به‌قه‌ڵه‌م، مرۆڤی شاره‌زا کردووه به‌و شتانه‌ی که نه‌یده‌زانی)

تۆمارێکی ناوازە:

لە هەموو دەقێکی عەرەبی قورئان یان وەرگێڕانی واتاکانی بە هەر زمانێ، خێرا هەمان قاڵب وەردەگرێت، نەگونجان و جیاکاری تێدا نیە، لە قورئان و وەرگێڕانەکانی بە زمانەکانی تریش نابینیت هاتبێت (موحەممەد تەمەنی چل ساڵ بوو کاتێك بانگەوازی یەکەمی پێگەیشت) یان بڵێت (ئەو لە ئەشکەوتی شاخی حەرائدا بوو) یان بڵێت (جیبریلی فریشتەی بینی) یان بڵێت (ترسا بوو) یان ڤن هەڵسوکەوت و وەلامدانەوەی هەبوو بۆ فەرمانی (اقرأ)، کاتێك فریشتەکە دوای تەواوکردنی پێنج ئایەتەکە ڕۆیشت، موحەممەد (ﷺ) بە دووری سێ میل لە باشووری مەککە گەڕایەوە بۆ ماڵی خەدیجەی هاوسەری ئازیزی و چی دیبوو هەمووی بۆ گێڕایەوە و پێی وت (دامپۆشە، دامپۆشە)، ئەمە هەمان ئەو ئسلووبەیە کە دەیوت (لە دێر زەمانەوە وابووە) بەلام قورئان هیچکام لەمانەی بۆ باس نەکردوین، بۆیە قورئان لە تۆمار و گێڕانەوەدا زۆر ناوازەو بێ نموونەیە، بەکورتی قورئان موعجیزەیە.

وێڕای ئەمەش پێچەوانەی هەر هەوڵێکی مرۆیی بۆ هونەری ئەدەب، تیایدا هەموو شتێك بە سەرەتایەك دەست پێ دەکات: یەکەم وشەو یەکەم ئایەتی سروشی قورئانی یەکەم سوورەت و یەکەم ئایەتی قورئان نیە، دەبینین کەوتووەتە سوورەتی نەوەد و شەشی قورئانی پیرۆز، بۆیە ئەمە

سروشێکی خواییەو خوای گەورە رێنموونی موحەممەدی هەڵبژێردراوی کردووە، کتێبێکی ئایینی لەم سەرزەوییەدا نیە وەك قورئان بێت یان ئەو رێڕەوەی قورئانی گرتبێتەبەر، چونکە هیچ سروشێ نیە وەك قورئان بەو خاوێنە رەسەنیەی کاتی دابەزینی تۆمار و پارێزراو مابێتەوە.

دەروونناسێکی نموونەیی:

ئەو رێزەم پێ بەخشرا لەگەڵ گەنجێکی کەنەدی بیروباوەڕی خۆم سەبارەت بە یەکەم بانگەوازی موحەممەد(ﷺ) بخەمەڕوو وەك ئەوەی لە پێنج ئایەتی یەکەمی سوورەتی عەلەقدا هاتووە، من لە گەشتێکدا بوو کە دەصووم بۆ گەورەترین مزگەوتی نیوەی گۆی باشوور، کاتێك قسەمان دەکرد سەبارەت بە کارو پیشەکەی پرسیارم لێکرد، ئەویش وتی لە خوێندنی بالادا سەرقاڵی بواری دەروونناسیە، منیش وتم دەروونناسی؟ خێرا بیریم برد بۆ لای پێنج ئایەتی یەکەمی سوورەتی عەلەق و لێم پرسی لێکدانەوەی چیە بۆ پەیام و ئەزموونی موحەممەد و باسی خوێندنەوەو نووسین و زانینی شتانێ کە پێشتر نەزانراون، برێ مەسەلە کە کێشەی تایبەتی خۆی و مۆزەکەی خۆیشی نەبون، جا چۆن عەقڵی ئاسایی کەسێك دەتوانێت بیر لە شتانێ بکاتەوە کە پێشتر لە هیچ شوێنێ ئەزموون نەکراون، بە گەنجەکەم وت شرۆڤەیەکی ئەمەم بۆ بکە، گەنجەکە وتی ناتوانێت شتی وابکات و بڕوام وایە

لەو کێشەدا کلۆڵ کەوتووە، منیش وتم دەی بڕوانە ئەو کەسە چی دەڵێت. ئینجا پێنج ئایەتەکەی سەرەتای سوورەتی (النجم) م بۆ خوێندەوە:

﴿ وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ (١) مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ (٢) وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ (٤) عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَىٰ (٥) ﴾ النجم: ١ - ٥

(سوێند بە ئەستێرە کاتێ ئاوا دەبێ، هاوڕێکەتان (موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) گومڕا نەبووە وە لە ڕاستی لای نەداوە، وە لەهەواو هەوسەوە قسە ناکات کە قورئان دەخوێنێت، هەرچی دەیڵێ (قورئانەو) سرووش دەکرێ بۆی، جوبرەئیلی زۆر بەتوانا فێری کردووە)

داوا لە موحەممەد (ﷺ) دەکات دووبارە هەواڵ بدات بە قەومەکە:

﴿ قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا (١١٠) ﴾ الكهف: ١١٠

(بەڵام سرووشم بۆ دێت بەڕاستی پەروەردگاری ئێوە پەروەردگارێکی تاك و تەنیایە جا هەر کەس بەتەمایە بەخزمەت پەروەردگاری بگات (لە قیامەتدا) ئەوە با کردەوەی چاك بکات وەك لە پەرستنی پەروەردگاری دا کەس نەکات بەهاوبەشی.)

گەنجەکە بە ئەدەبەوە وەڵامی دایەوە(بەباشی بیر لەو مەسەلەیە دەکەمەوە) جا ئەگەر ئێمە خۆمان راستیەکانی قورئان بزانین، دەتوانین لە هەر بوارێکی زانستیدا لەگەڵ تایبەتمەندانی ئەو بوارەدا دەرگای گفتگۆ بکەینەوە.

ناوەندی بانگەواز وەك شانەیەکی هەنگ چالاکی خەڵکێکی زۆر بۆ لای خۆی رادەکێشێت تا گفتگۆ و دانووستان بکەن، لەنێویاندا رۆژنامەنووس و بەرپرسانی رۆژنامەکان، خێرا بۆم دەرکەوت کەسێکیان داناوە من قسەی لەگەڵ بکەم کە کەسێکی رۆژنامەنووسە، پێیان وتبوو من پێم خۆشە قورئانی پیرۆزی وەك موعجیزەیەکی رۆژنامەوانی پێ نیشان بدەم، کەسیش نەبوو ئامادەی گوێگرتن نەبێت، ئینجا وتم بە چیرۆکی پێغەمبەری ئازیز مووسا دەست پێ دەکەم، بە هەمان ئسلووبی(لەدێر زەمانەوە وابووە) ناتوانین بگەینە چارەسەرێ، هەروەها ناتوانین وردەکاری سەبارەت بە وردەکاریەکانی ژیانی مووسا و منداڵی و دایکی خوشکی بزانین، بۆیە دەبێت وردەکاریەکان بەدەست بخەین، منیش وا دەستم پێکرد:

مووسا هات و بینی دوو کەس شەڕیانە، کەسێك سەر بە هۆزەکەی خۆی و ئەوی تریان لە دوژمنانی هۆزەکەی، بۆیە چوو تا دژ بە کابرای میصری یارمەتی جوولەکەکە بدات، لەکاتی شەڕەقسەی نێوانیاندا مووسا بە توندی بۆگزێکی دا لە کابرای ستەمکار و بەوەش کابرا مرد، دوای ئەوە مووسا

رایکرد بۆ بیابانی سینا، بینی کەوتووەتە نێو کۆمەڵێ خەڵکەوە، لەوێ یارمەتی دوو ئافرەتی دا کە لە چەرمەسەری و نارەحەتیدا بوون، دواجار لای باوکی ئەو دوو کچەوە کارێکی دەستکەوت، دوای تەواوکردنی وادەی کارەکەی کە زیاد لە هەشت ساڵ دەبوو، مووسا بێزار بوو لە ژیانی لادێ، چونکە ئەو لە شانشینێ لەنێوەندی شاردا گەورە بووبوو، بۆیە لای سەخت بوو لەو کەشەدا بژی، بۆیە ویستی گۆڕانێ لە ژیانیدا بکات و داوای لە باوکی هاوسەرەکەی کرد مۆڵەتی بدات، خەزووریشی کەسێکی زۆر تێگەیشتوو بوو، بۆیە مۆڵەتی دا بە مووسا تا بڕوات.

مووسا لەگەڵ ژن و منداڵەکانی و ئەو بەشە مەڕو بزنەی هەیبوو کەوتەڕێ، کەمێك ڕۆیشت و گەیشتنە بیابانی سینا، ئاراستەکەی لێ تێکچوو و ئەو شوێنەشی جێهێشتبوو کە تیایدا دەحەسایەوە، دوای ئەوەی ئەو بەشە گۆشتە برژاوەی پێیان بوو تەواو بوو، هێشتا نانی وشکی پێ بوو، بەڵام کێشەکە گۆشت بوو، دەکرا مەڕێ یان بزنێ سەر ببڕێ، ئەمە ئاسان بوو، بەڵام سەختیەکە لە ئاگرکردنەوەیەکدا بوو، بۆیە ئەرکێکی قورس بوو، دەکرێ نیوەرۆژێ دوو شت بەیەکدا بدەیت تا ئاگرێ بکەیتەوە؟ ئەوکاتیش کیبریت و چەرخ و شتی وانەبوو، بۆیە کاری یەك ڕۆژی دوادەخست.

باشە بەڕێز دیدات موعجیزە بەڵێندراوەکە کوا؟

تا ئێستا پاشخانێکی چیرۆکەکەم بۆ باس کردون، هەموو ئەمە تەنها لە چوار ئایەتدا باشکراوە، یان بلێین لە چوار رستەی زۆر کورتدا، بەڵام لەبەر گرنگی کارەکە سەرنجتان رادەکێشم بۆ ئەوەی دەمەوێت لێی رامێنن کە ئەویش کرۆکی کاری رۆژنامەنووسیە.

من نزیکەی سی کیلۆمەتر لە باکووری شاری دربنەوە دەژیم، پێش ئەوەی هێڵی خێرای بەستنەوە لەگەڵ شاری دربن هەبێت، من رێی کەنار دەریام دەگرتەبەر بۆ ئەوەی بگەمە دربن، من پێشتر لە کەناراوی دربنەوە دەچووم، لە خاڵی یەکتربڕدا هەواڵم لە فرۆشیارێ وەردەگرت کە هەموو بەیانیەك رۆژنامەی (الرحمه المولوده) ی دەفرۆشت، رۆژانە ناونیشانەکەی هەڵدەواسی تا سەرنجی کڕیاران رابکێشێت، جار دوای جار و بە خوێندنەوەی ریکلامەکان، بڕیارم دا ئەو رۆژنامەیە نەکڕم، بەڵام لە شێنی وەستانی ئۆتۆمبێلەکەم لە نێوەندی دربن دوو رۆژنامەفرۆشی تر هەبوو، وێڕای ئەوەش چووم رۆژنامەکەم کڕی.

دوای چەند جارێك رام بەرامبەری گۆڕا، پرسیارم لە خۆم دەکرد بۆچی وا رام گۆڕا، دواتر زانیم هەرچەندە ئەو رۆژنامە دەخرایەروو بۆ فرۆشتن، بەڵام ریکلامەکانی سەر کەناراوەکە بۆ کەسی ئەورووپی بوون، بەڵام لەو ناوچەی من پیایدا تێپەڕ بووم بۆ دەستەی نێردە ئاسیاییەکان بوو، بەو ریکلامە لە ناوچەی ئەفریقی و رەنگاورەنگەکان هانیان دەدات تا رۆژنامەکە بکڕن.

بۆیە رۆژنامەنووسی شارەزا دەبێت ریکلامی وا دابهێنێت کە وەلامدانەوەی هەبێت بۆ هەر چوار رەگەرزە گەورەکەی ئەمرۆ، ئەمە دەبێتە نموونەیەکی دەگمەنی رۆژنامەنووسی، بێگومان رۆژنامەنووسان رازی دەبن بەو ئەنجامە، دەی رێ بدەن لەسەر ئەم بنەمایە شرۆڤەیەکی قورئانی پیرۆز بکەین.

گوتاری گەردوونی:

موحەممەد (ﷺ) پێغەمبەری ئیسلام بوو و لە مەدینە بوو کە جوولەکەو مەسیحی و موسڵمان و دووڕوو و بێباوەڕیشی تێدابوو،[1] پێغەمبەریش(ﷺ) سروشی خوایی بۆ دەهات و دەیگەیاند بەو هەموانە، جا دەبوو لە ریکلامەکەیدا چی بکات تا سەرنجی هەموو کۆمەڵە جیاجیاکان راکێش بکات؟ بۆیە رێخۆشکەری کرا بۆی تا ئایینەکەی بڵاوبکاتەوە (وهل اتاك حديث موسى) (طه: 9)

دەتوانیت تێبینی ئەو ورووژاندنە بکەیت؟ جوولەکەو مەسیحیەکان چاوەڕێ بوون زیاتر لەو بارەوە ببیستن، دەیانویست موحەممەد بخەنە داوەکەوە، چونکە لە دەروونی خۆیاندا دەیانوت ئەم کابرا عەرەبە چی

---

[1] - دووڕووەکان لەگەڵ کەرویشك رادەکەن و لەگەڵ راوچی راو دەکەن.

دەزانێت سەبارەت بە مووسا، خۆ موحەممەد نەخوێندەوارە، موسڵمانانیش تینووی زانستن، دەی بێزەحمەت ئادە چیت لایە سەبارەت بە مووسا پێمان بڵێ.

بێباوەڕ و دووڕووەکانیش گوێیان شل کردبوو تا ئاگاداری مشتومڕەکە سێ لایەنیەکە بن سەبارەت بە مووسا، مشتومڕی موسڵمان و مەسیحی و جوولەکە، موحەممەدیش (ﷺ) بەسەرهاتی مووسای لە قورئانەوە دەخوێندەوە بۆیان ﴿ إِذْ رَءَا نَارًا ﴾ ئاگرێکی بینی، شانۆییەك بوو، دەکرێت دیمەنێ بێنیتە پێش چاوی خۆت، موحەممەد (ﷺ) بێ هیچ نووسینەوەیەك دوای دوو هەزار ساڵ لە لەدایکبوونی عیسا کە مەسحی و جوولەکە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گەیشتوونەتە لووتکەی بواری ڕاگەیاندن تا لە جەنگدا بەکاری بهێنن لە ژێر ناونیشانی ئوممەتی ڕۆژئاوایی کۆمپانیای تیلیگرافدا (مەنووسە، تەلەگراف بنێرە).

جا چ خوێندنگەیەکی ڕۆژنامەنووسی موحەممەدی پێگەیاند تا ئەو هونەرە بەهێزەی ئەمریکیە لە بواری فرۆشتندا شارەزا بێت؟

بەڵکو ڕێخۆشکەری کرد بۆ کارەکەی ﴿ فَقَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓاْ ﴾ طه: ١٠

جا بێزەحمەت بەراوردی ئەو ئایەتە بکە لەگەڵ وەرگێڕانی واتاکانی قورئانی پیرۆز، لەگەڵ دۆست بێ یان دوژمن، هەمدی ئەو کورتی و

خۆدوورگرتن لە زێدەکاریە لە وشەکاندا بەدیدەکەیت، موحەممەد(ﷺ) هیچ ڕاهێنانێکی نەکردبوو بۆ پوختکردنەوەی وشەکان، تەنها فەرمایشتی خوای دەخوێ،دەوە بەو چەشنەی بۆی دابەزیبوو، دابەزینەکەش لەرێی فریشتەی گەورە جبریلەوە بوو، ئەوکات هێشتا کتێبی پیرۆزی مەسیحی بە زمانی عەرەبی بوونی نەبوو، واتە لە شەش سەدەی یەکەمی مەسیحیدا، ئەوکات پێغەمبەر(ﷺ) قورئانی بۆ دابەزی و دەیخوێندەوە.

ئێستا ڕێ بدە زیاتر بچینە مەسەلەکەوە، بێزەحمەت بەراوردی سروشی قورئانی بکە لەگەڵ چیرۆکی کتێبی پیرۆز وەك لە کتێبی دووەمی کتێبی پیرۆزدا هاتووە (كتاب الخروج: الاصحاح 1و 2و 3) کە تیایدا باسی ژیانی پێغەمبەر مووسا دەکات و ئێمەش لێرەدا دەیخەینەڕوو، من سەرەتای چیرۆکەکە لەناو کتێبی پیرۆزدا دێنم:

(ئێستا ئەوە ناوی ئەو نەوانەی ئیسرائیلە کە لەگەڵ یەعقووب هاتن بۆ میصر، هەرکەس لەگەڵ ژن و منداڵەکانی هات: ڕاوبین‌و شەمعوون‌و لاوی‌و یەهووزاو یەساکرو زبۆلۆن‌و بنیامین‌و دان و نەفتالی‌و جادو ئەشیر، نەفسی هەموو ئەوانەی لە پشتی یەعقووبەوە دەرچووبوون حەفتا نەفس بوو(بەڵام یووسف لە میصر بوو)) (سفر الخروج 1: 1-5).

لەدایکبوونی مووسا:

بارەکە ئاوایە، ئەرێ خوا وا قسە دەکات؟ بێزەحمەت بەراوردی ئەو دەقانەی کتێبی پیرۆز بکە لەگەڵ چوار ئایەتی قورئان کە پێشتر هێنامان.

با لەسەر چیرۆکە قورئانیەکە بڕۆین، مووسا کە لە نێو بیابانی سینادا هاودەم بە ژن و منداڵ و مەڕوماڵاتی دەهات و دەچوو، پێویستی بە دوو شت بوو، ئاگری دەویست تا گۆشتی پێ ئامادە بکاتەن دەشبوو بەرەو شوێنێ بچێ لەو بیابانەدا تا بگاتە خەڵکی، بەلام ویستی خوا شتێکی تر بوو، مووسا ئەو رێیەی دەبڕی کە ئامادەکاری بوو بۆ پێغەمبەرایەتیەکەی، ئەوەبوو لە کێشەی ئاگرەوە چوو بۆ ئەو راستیە رۆحیە هەڵگیرساوەی کە لە رحی مرۆیی ملیۆنەها ساڵەدا هەیە، مووسا بەئاراستەی راستی سەرکردایەتی مرۆییدا رێی دەکرد، ئەو ئاگرەی مووسا بەدیکرد ئاگرێکی ئاسایی نەبوو، ئاگر واتە بوونی کەسانێکی تر کە بتوانیت زانیاری و رێنمایی رێگەکەیان لێ وەربگریت:

﴿ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ يَٰمُوسَىٰٓ ۝١١ إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى ۝١٢ ﴾ طه: ١١ - ١٢

(جا کە گەشتە لای (ئاگرەکە) بانگی لێ کرا: ئەی مووسا، بەڕاستی من پەروەردگاری تۆم دەی پێڵاوەکانت داکەنە (لەبەر رێزی شوێنەکە) چونکە بێگومان تۆ لە شیوی پیرۆزو بەفەڕی (طووا) دایت)

مێژووی رۆحی مووسا لێرەوە دەست پێ دەکات، بە دەربڕینی کتێبی پیرۆز (ئەمە رۆژی لەدایکبوونتە)، بەم شێوازە خوای گەورە ئەرکی یووسف پێغەمبەری گەیاند بە یووسف وەك لە سیفر مەزامیر 2:7 دا هاتووە.

ئەو دەقە قورئانیەی پێشوو پڕە لە واتای ناوەکی کە لە چەند ئایەتێکی کورتدا رەنگ دەدەنەوە، لە بنەڕەتیشدا دوو مەسەلەی کێش و واتا لە دەقەکەدا واتایەکی بەهێزی ناوەکی لەخۆ دەگرن، بۆ بەراوردێکی سادە با هەر چوار ئایەتەکە دابنێینەوە:

﴿ وَهَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿٩﴾ إِذْ رَءَا نَارًا فَقَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِقَبَسٍ أَوْ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدًى ﴿١٠﴾ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِىَ يَٰمُوسَىٰٓ ﴿١١﴾ إِنِّىٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخْلَعْ نَعْلَيْكَ ۖ إِنَّكَ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى ﴿١٢﴾ ﴾ طه: ٩ - ١٢

(ئەی (موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) ئایا هەواڵ و دەنگوباسی مووسا پێغەمبەرت پێ گەیشتووە، کاتێ ئاگرێکی بینی (لە گەڕانەوەیدا بۆ میصر لە شەوێکی سارد دا) جا (مووسا) وتی بە خێزانەکەی لێرە بمێننەوە بەڕاستی من ئاگرێکم بەدی کردووە (ئەڕۆم بۆ لای) بەڵکو لەو ئاگرە چلۆسکێکتان بۆ بێنم(خۆتانی پێ گەرم بکەنەوە) یان لای ئەو ئاگرە ڕێگا نیشان دەرێکم دەست کەوێ، جا کە گەشتە لای (ئاگرەکە) بانگی لێ کرا:

ئەی مووسا، بەڕاستی من پەروەردگاری تۆم دەی پێڵاوەکانت داکەنە (لەبەر ڕێزی شوێنەکە) چونکە بێگومان تۆ لە شیوی پیرۆزو بەفەڕی (طووا) دایت)

بریاری تۆ چیە؟

چۆنە کەسێك نەریت و چیرۆکە خەیاڵیەکان بێنێ تا بڕیار بدات لەسەر دەقی پوختی ئاسمانی؟

ئەمە بۆ ڕەخنەگرێکی سۆزداری وەك تۆماس کارلایل کە یەکێکە لە گەورە بیریارانی سەدەی پێشوو هێندە سەخت بوو کە نەیتوانی بە تەواوەتی لە فیترەت و خاوێنی تەواو تێبگات، بۆیە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز وا پێناسە دەکات: (ماندووکەر و تێکەڵ و تێکناڵاو و وشکە، بنیادی هونەری و پێکهاتەی لاوازە، گەمژەو خەیاڵیە).

دوای بەراوردی دەقی چیرۆکە قورئانیەکان لەگەڵ چیرۆکەکانی کتێبی پیرۆزدا ئێستا بڕیاری تۆ چۆنە؟ دوای ئەوە پێویستە ڕۆژنامەنووسێکی سەرنەکەوتوو ببینم کە نەیتوانیوە بەهای موحەممەد جیابکاتەوە؟ یانی بێ هیچ هەوڵێ بۆ جیاکردنەوەی لایەنی شیکاری و ڕاڤەکەی ڕاستەوخۆ وەك شارەزایەکی ڕۆژنامەنووسی دەیکات بۆ ڕۆژنامە یان گۆڤارەکەی، ڕێنماییەکانی خۆی دادەڕێژێت.

موعجیزەی کتێبی برووسکەکان

باشترە قورئانی پیرۆز بە (کتێبی برووسکەکان) ناو ببەین لەبەرئەوەی پەیامەکانی وەك بروسکە هاتون و پێغەمبەران دەدوێنێ تا وەلامی یەك پرسیار بدەنەوە:

یەکەم: مەی و قومار:

خوای گەورە دفەرموێت:

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾ ﴾ البقرة: ٢١٩

(پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی عەرەق و قومار بلێ: لەم دوانەدا گوناهی گەورەو چەند قازانجێك هەیە بۆ خەلکی بەلام گوناهەکەیان گەورەترە لە قازانجەکەیان وە پرسیارت لێ دەکەن چی ببەخشن بلێ: ئەوی لێتان زیادە، ئاوەها خودا بەلگەکان ڕوون دەکاتەوە بۆتان تا بیربکەنەوە.)

قورئان و فەرموودە

ئەوەی پێشوو تەنها نموونەیەك بوو سەبارەت بە چۆنێتی فەرمایشتی خوا، دواتریش چەند نموونەیەکی تر دێنینەوە، ئایا هیچ شەیدایەکی راستی دەتوانێت بە رێگەیەکی ئاسانتر قەناعەت بکات؟ لە وەڵامدا نا دەبیستین، خوای گەورە بە چەند دەستەواژەیەکی روون دەماندوێنێ(قل هل یستوی الاعمی و البصیر) (الرعد: 16).

بە دڵنیاییەوە نەخێر، ئێستا فەرمایشتی خوا سەبارەت بە مەی و سەرخۆشکەریەکان لەگەڵ فەرموودەی پێغەمبەر موحەممەد(ﷺ) بکە، ئەو فەرموودانەی لە لێوەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بیستراون و لەرێی هاوەڵانەوە تۆمار کراون.

مالیکی کوڕی ئەنەس لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) هێناویەتی کە نەفرینی کردووە لە هەر کەسێ بە هەر شێوازێ پەیوەندی هەبێت بە بەرهەمهێنان و بەکارهێنانی هەر جۆرە خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەر، بۆیە دەفەرموێت:

نەفرەت لێکراوە ئەوەی ترێ بۆ مەی بەرهەم بهێنێت.

نەفرەت لێکراوە ئەوەی دەیفرۆشێت.

نەفرەت لێکراوە ئەوەی ئاوەکەی دەگرێتەوە.

نەفرەت لێکراوە ئەوەی دەیکاتە شووشەوە.

نەفرەت لێکراوە ئەوەی دەیخواتەوە.

دەقی فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت، پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ) بەم دەقە فەرموویەتی (ئەوەی زۆرەکەی کەسێك سەرخۆش بکات کەمەکەشی حەرامە).

بۆیە هیچ بیانوویەکی گومڕاکەر نیە بۆ قومێ یان تکەیەکیش، پێچەوانەی ئامۆژگاریەکەی پۆلس بۆ تیمۆساوس: (دوای ئەوە ئاو مەخۆرەوە، بەڵام کەمێك لە مەی بخۆرەوە، ئەمەش بۆ شیفای گەدە و نەخۆشیە زۆرەکانت). (تیمۆساوس 5: 23).

یان پەروەردەی سولەیمان و وەسیەتەکانی بۆ کۆیلایەتی و ملکەچکردنی گەلی داگیرکراو: (سەرخۆشکەرێ بدەن بەوەی لە سەرەمەرگدایە، مەی بدەن بەوەی دڵی قورسە-دڵتەنگە-) (با بخواتەوەو هەژاری خۆی بیر بچێتەوەو ئیتر نارەحەتی خۆی بیرنەیەتەوە) (الٔمپال 31: 6-7).

ئەوەك بیرمان بچێت، بێزەحمەت جارێکی تر بڕوانە ئسلوبی قورئانی و فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)، بزانە دان بەوەدا نانێیت کە هەردووکیان لە جیهاندا نموونەیان نیە چ لەرووی پێکهاتە و بەرزیەوە؟

نموونەیەکی تر تایبەت بە وەڵامی تەلەگرافی سەبارەت بەو پرسیارەی تایبەتە بە مانگی نوێ.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ ۖ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ ۗ وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ ۗ وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٨٩﴾ ﴾ البقرة: ١٨٩

(پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی نوێ بونەوەی مانگە نوێکان بڵێ ئەمانە نیشانەی کاتەکانن بۆ خەڵکی و بۆ حەج وەچاکە ئەوە نی یە کە لەپشتی خانووەکانەوە بچنە ژوورەوە بەڵکو چاکە ئەوەیە ئەو کەسە پارێزکارو لە خوا ترس بێت وەبچنەماڵەکان لە دەرگاکانیەوە وە لەخوا بترسن تا ڕزگار ببن.)

چەندین خورافە هەن تایبەت بە مانگی نوێ وەك ئەمڕۆش هێشتا ئەو خورافانە ماون، بۆ حسابکردنێکی کات کە ڕۆژژمێری مانگی بەکاردێ، مانگی نوێ نیشانەیەکی گەورەیە کە خەڵك بۆ بینین و دیاریکردنی جەژنە ئیسلامیەکان چاویان لەسەریەتی، لەو نێوەندەشدا حەج پشتی بەستووە بە دەرکەوتنی مانگی نوێ.

زەکات:

**خوای گەورە دەفەرموێت:**

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ۖ قُلْ مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ وَٱلْيَتَٰمَىٰ
وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢١٥﴾ ﴾ البقرة: ٢١٥

**(پرسیارت لێ دەکەن چی ببەخشن(لەڕێی خوادا) بڵێ ئەوی دەیبەخشن لە ماڵی پاکو حەڵاڵ با بۆ باوك و دایك و خزمانی نزیك و هەتیوان و هەژاران و ڕێبواران بێت وە هەرچی بکەن لە چاکە ئەوە بێگومان خوا ئاگادارە لێی)**

**ئەمەش سێ پرسیار لەخۆدەگرێت سەبارەت بە چاکەکردن و بەخشین:**

1- **پێویستە چی ببەخشین؟**

2- **بە کێی ببەخشین؟**

3- **چۆن ببیبەخشین؟**

## چی ببه‌خشین؟

وه‌لامه‌که لێره‌دایه، هه‌ر شتێکی پاك و به‌سوود و به به‌ها ببه‌خشه، له‌وانه‌یه موڵك بێت یان سامان و پاره بێت یان له‌وانه‌یه هاوکاری ده‌ستی یان ئامۆژگاری یان وشه‌یه‌کی جوان بێت(هه‌ر چاکه‌یه‌ك بیکه‌ین ئه‌وه صه‌ده‌قه‌یه).

له‌لایه‌کی تره‌وه هه‌ر شتێ ببه‌خشی و سوودی نه‌بێ ئه‌وه خێری تێدا نیه، یان به مه‌به‌ستی ئازاردان به‌خشیت وه‌ك ئه‌وه‌ی شمشێرێ ببه‌خشیت به شێتێ، ده‌رمان یان شیرینی یان ته‌نانه‌ت سامانێ ببه‌خشی به که‌سێك که مه‌به‌ستت بێت به‌وه بکه‌وێته شیرکه‌وه یان بۆ به‌ره‌و خراپه بردنی، ئه‌وه هیچ خێری تیا نیه، به‌ڵکو دیاریه‌کی نه‌فره‌ت لێکراوه.

## به کێی ببه‌خشین؟

ده‌کرێت به دیاریه‌ك که ده‌یبه‌خشیت ببێته هۆی ده‌ستخۆشی ئه‌و عالەمه، ئه‌ویش به یارمه‌تیدانی نه‌داران و قه‌رزاران، ئه‌مه‌ش صه‌ده‌قه‌یه.

جا چ دیاریه‌ك هه‌یه سیفه‌تی خودپه‌رستی تێدا نه‌بێت، ئاستی پێویستی یان بانگه‌شه‌که پێناوێکه که ده‌بێت تۆ خۆت به‌دواداچوونی بۆ بکه‌یت، ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌ت گوێ پێ نه‌دا ئه‌وه خودپه‌رستیه‌ك له پشت ئه‌و کاره‌وه‌یه.

چۆن بیبەخشین؛

وێنای خوای گەورە هەموو داو و دیمەنەکانی هەڵخەڵەتاندن و نەبوونی دڵسۆزی دادەخات.

موحەممەد (ﷺ) لە وەڵامێکیدا سەبارەت بە پرسیا لە سروشت برووسکەیەکی تری وەرگرتووە کە ئەویش پەیوەستە بە ڕۆحەوە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾ الإسراء: ٨٥

(وە (ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) پرسیارت لێ دەکەن لەبارەی ڕۆحەوە (کە چییە) بڵێ ڕۆح لە کارو فەرمانی تایبەت بە پەروەردگارمە وە ئێوە تەنها کەمێك لە زانیاریتان پێ بەخشراوە.)

ئەو ڕاستیەم پێ کەنار ناخرێت کە قورئانی پیرۆز جیاواز لە هەر کتێبێکی تری سەر زەوی کاریگەری هەیە، بەڵکو قورئان ڕاستەوخۆ باسی ئامانج دەکات، ئیتر هیچ جیاکاری و گەمەو ئەملاولایەکی تێدا نیە، لە هەر کتێبێکی گەورەدا ناتوانیت ڕوون و ئاسان بگەیت بەوەی دەتەوێت پێی بگەیت یان تۆماری فیلمێکی وەك (دە وەسیەتەکە) یان (شمشون و

ڕێنیشاندەرەکەی) یان (یووسف و کۆتری شیبا) کە دەکرێت بەرهەم بهێنرێت بۆشاشەی سینەما، بۆیە کتێبی پیرۆز وەك دەستنووسێکی نووسەر دەردەکەوێت، وەك هەموو شتێکی تر نەقلێکی ئاسانە بۆ قاپێکی زێڕین.

خوێنەرانی ئازیز ڕێ بدەن ئەوەتان بێنمەوە یاد کە لەکاتی توێژینەوەو گەڕان لەناو هەموو قورئاندا شتانێکی وەك ناوی باوك و دایکی موحەممەد (ﷺ) بەدی ناکەن، ناوی ژن و کچ و تەنانەت هاوەڵە ئازیزەکانیشی بەدی ناکەن، کەچی دەبینن لە یەك سوورەتدا بە تەواوەتی باسی مەریەمی دایکی عیسای مەسیح دەکات کە ئەویش سوورەتی مەریەمەو ژمارە نۆزدەیە لە قورئاندا، باسی عیسای کردووە و زیاد لە بیست و پێنج جار ناوی هاتووە، لەکاتێکدا ناوی موحەممەد (ﷺ) تەنها پێنج جار هاتووە، دەبێت هۆکار چی بێت؟

ئایا عیسا و دایکی لە موحەممەد و دایکی گرنگترن؟ نا بەهیچ جۆرێ، ئەی مەسەلەکە چیە؟ مەسەلەکە ئەوەیە لەبەر ئەوەی پاکی عیسا و دایکی خراوەتە ژێر پرسیار و تۆمەتیان بۆ کراوەو درۆی ڕوون و گەورەیان لەرووداکراوە، درۆ و بوختان دژ بە دایك و کورەکەی دەبێت ڕوون بکرێـەوە، بۆیە چیرۆکی سکپڕی مەریەم و لەدایکبوونی عیسا دەبێت تۆمار بکرێت، کەس هەرگیز سەبارەت بە ڕەچەڵەکی پێغەمبەری ئیسلام نەیپرسیوە، بۆیە لە هەموو قورئاندا یەك وشەش باسی لەدایکبوونی موحەممەد (ﷺ) نەکراوە،

قورئان ژیاننامەی موحەممەد نیە، بەڵام تێگەیشتن لەمە بۆ بێباوەڕان سەختە.

ڕێ بدەن نموونەیەك بێنینەوە لەسەر پەیوەندیەکی تەلەگرافی ناو قورئانی پیرۆز سەبارەت بە باسی ڕۆژی دوایی و کۆتایی ژیان:

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ۚ ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ۗ يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِىٌّ عَنْهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٧﴾ ﴾ الأعراف: ١٨٧

(ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) پرسیارت لێ دەکەن لە بارەی ڕۆژی دوایی یەوە کەی دەبێت بڵێ: زانینی ئەوە تەنها لای پەروەردگارمە هیچ کەس (ناتوانێ) کاتەکەی ئاشکرا بکات جگە لەو (پەروەردگار) (هاتنی قیامەت) بۆ ئاسمانەکان و زەویش گران و قورسە نایەت بەسەرتاندا (ڕوو نادات) لە ناکاودا نەبێت لە تۆ دەپرسن وەك ئەوەی کە تۆ لە (هاتنی) ڕۆژی دوایی ئاگادار بی (ئەی موحەممەد(صلى الله على وسلم)) بڵێ: بێگومان زانینی (هاتنی) ئەو ڕۆژە تەنها لای خوایە بەڵام زۆرێك لە خەڵکی نایزانن.)

به بەراورد لەگەڵ هەموو سیانزه ئیصحاحەکەی ئینجیلی قەشه مەرقەس، ئەم ئایەته بەسه تا ئەنجامی سی و حەوت دێڕی ئیصحاحێکت پێ بدات، ئەمەش تاقیکردنەوەیەکی ئاسانه بۆ جیاکردنەوه کتێبه نووسراوەکانی مرۆڤ لەگەڵ فەرمایشتی خوادا، دەبینن قورئانی پیرۆز هیچ زەخرەفەو زێدەکاریەکی تێدا نیه.

چەندین نموونەی تر هەن له قورئاندا که دەکرێت بیانخەینەڕوو تا ئەوه بسەلمێنن ئەو چیرۆکه دەستکردی مرۆڤ نیه، بەڵکو تەواو جیاوازەو له راستیدا دەکرێت سەبارەت بەم تەنها خاڵه یەك بەرگی گەوره بنووسرێت، لەگەڵ ئەوەشدا به نموونەیەکی تری قورئانی پیرۆز کۆتایی دێنین بەم باسه، سوورەتێکی کورتی چوار ئایەتی، هەموو چوار ئایەتەکه ژمارەی وشەکانی کەمتره لەو ئایەتەی پێشوو:

﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴿٤﴾﴾ الإخلاص: ١ - ٤

(بڵێ: ئەوه خوای تاك و تەنیا، ئەو خوایەی بێ نیاز و جێ ی نیاز و ئومێده، کەسی لێ نەبووەو لەکەس نەبووه، وه هەرگیز هیچ کەس هاوشێوه و هاوتای نی یه)

لێرەدا دیدی شەخصی خۆم لە روانگەی سروشتی خواییەوە دەخەمە روو و پێم وایە سروشتی خوایی –فەرمایشتی خوا– ئەمانە دەگەیەنێت:

تاقیکردنەوەی زانستی یەکخواپەرستی:

بە رێنمایی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە لای موسلمان گونجاوە کە ئەگەر سێ جار ئەو چوار ئایەتەی قورئان بخوێنێـەوە ئەوە بەرەکەتی رۆحی خوێندنەوەی هەموو قورئانی پیرۆزی بۆ دەنووسرێت، چی وایکردووە ئەو ئایەتە هێندە ناوازە و گرانبەها بێت؟ نە دەنگ و نە زەنگی دەگمەنە، ئەی چیە کە خەندەو فرمێسك بە مرۆڤ دەبەخشێت، جا تاقیکردنەوە بۆ ئایین ئەو بارە بەرزە دەبەخشێت.

شتێ نیە لە زانستەکانی یەکخواپەرستی یان چەمکی پەیوەست بە خوا بەدەر بێت لە کرۆك و واتای ئەم چوار ئایەتە، چونکە هەستکردنە بە زانستی خوا، لەوێوە دەتوانیت هەر بیرۆکەیەك سەبارەت بە خوا قبووڵ بکەیت یان بەرپەرچ بدەیتەوە یان راست و هەڵە جیا بکەیتەوە، ئەمە بە تەواوی وەك تاقیکردنەوەی زێڕ وایە، پرسیار لە زەڕەنگەر بکە چۆن بەردەکن تاقی دەکەیتەوە، جا تاقیکردنەوەی ئایەتەکانی قورئان چۆن بێت؟

لەچوارچێوەی ئەو کارانەی لە سەردانێکم لە زامبیا بۆم ئەنجام درا تا لە نێوەندی سالّی 1975ز. چەند وانەیەك پێشکەش بکەم، لە لوساکا پەیوەندیەکم پێگەیشت کە تیایدا هاتبوو بلیتێکی فڕۆکە نێردراوە بۆ دربن و دەتوانم لە بنکەی سەرۆکی هێڵی فڕۆکەوانی باشوری ئەفریقیا لە نێوەندی شارەکە وەریبگرم، منیش چووم و گەیشتمە ئەوێ و گەیشتمە پرسگەکەو بە کابرای بەرپرسی ئەوێم وت کە هاتوم تا ئەو بلیتی سەفەرە وەربگرم کە لە لۆساکاوە نێردراوە، ئەویش پێی راگەیاندم بچم بۆ لای یەکێك لە خاتوونەکان کە لەوێ بەشێوەیەکی بازنەیی دانیشتبوون، هەرکامیان کۆمپوتەرێکی لەبەردەمدا بوو، زۆربەیان سەرقالّی سەردانکەری تر بوون، منیش وتم کامیان؟ کابراش بە دەست ئاماژەی بۆ کردم و وتی هەرکامیان بێت، ئاماژەی پێکردم بەرەو لای خاتوونەکان بچم.

لەو کاتەدا نەمزانی کابرا بۆچی لەو پرسیارە ساکارەی من تووڕە بوو، منیش دەمویست نامیلکەیەکی دوورودرێژ بەدەستبهێنم تایبەت بە بلیتەکان، چەند جارێك کەم لە ژیانمدا پێشتر بەکارمهێنابوو، بۆیە هیچ هەڵەیەکم لە کارەکەدا بەدی نەدەکرد، ئەی چۆن یەکێك لەو ئافرەتانە دەتوانێت بلیتەکەی منی لای بێت؟ سەرم سوڕما، بەلام دەنگە گڕەکەی کابرا ناچاری کردم بەرەو لای خاتوونەکان بچم، بە شەرمێکەوە چووم بۆ لای یەکەم خاتوون کە دەستی بەتالّ بوو و پێم وت بۆچی هاتوم، هەروەها پرسیارم کرد سەبارەت

بەو بلیتەی چاوەڕێ بووم وەریبگرم، ناوەکەی خۆم پێ وتبوو، خاتوونەکە هەمدی ناوەکەی منی پرسی، منیش بە نووسین بۆم نووسی، واتە لەسەر کیبۆردەکەی بەدەستی نووسیم، دەمدی ئافرەتەکە کاتێك دەنووسێت تەنها تەماشای شاشەکە دەکات، نەمدەتوانی لە شوێنی دانیشتنەکەمەوە نووسینەکە ببینم، ئەویش سەری جووڵاند و بە ئاماژەیەك وتی بەڵێ وەك ئەوەی ڕێ بدات تەماشای نووسینەکە بکەم، منیش پێشنیاری کاتژمێر شەشم کرد، ئەویش ڕازی بوو و لەسەر کیبۆردەکە چەند وشەیەکی نووسی، هەروەها وتم کە نیازم هەیە کاتژمێر سێی دوای نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر لە جوهانسبۆرگەوە بەرەو لۆساکا بڕۆم، دەمزانی کە ئەوانەی منیان بانگهێشت کردووە دەیانەوێت پێناوەکانی ڕاگەیاندن و تەلەفزیۆن گەیشتنم پەخش بکەن، ئافرەتەکە چەند وشەیەکی تری نووسی و دواتر پرسی دەیەوێت لەڕێی جابۆرۆن یان مابیۆتۆوە بچم بۆ لۆساکا، منیش وتم گرنگ نیە هەرکامیان بێت مادەم من بتوانم بۆ کاتژمێر سێی دوای نیوەڕۆی ڕۆژی چوارشەممە بگەم، ئەویش جارێکی تر دەستی خستەوە سەر کیبۆردەکەو تەماشای کیبۆردەکەی دەکرد و وتی ببورە، شوێنی تۆ لە هێڵی ئاسمانی زامبیەو ناتوانین بلیتەکەت بگۆڕین بۆ هیچ هێڵێکی تر، چونکە ناتوانین ئەمڕۆ پەیوەندی بکەین بە هێڵی زامبیەوە، چونکە ئەوان بەهۆی ڕۆژی نیشتمانی ئەو وڵاتەوە داخراوە، بۆیە داوای کرد ڕۆژی دوایی سەردانیان بکەمەوە.

زۆر سەرسوڕهێنەر بوو، بیرم کردەوە چۆن بێهیوا بووم، چۆن ئەو بلیتە بۆ من بوو کەچی نەگەیشتە دەستم، بەردەوام وامدەزانی بلیتەکەم لەبەردەستیدا بووە.

لابردنی نەهامی:

به سەرسامیەوە پرسیم چۆن ئەو هەموو زانیاریانەت دەستکەوت؟ ئەویش وتی لە کۆمپیۆتەری سەرۆك لە جوهانسبۆرگ، ئەو خاتوونە بە ئەرمونیانی زیاتر مەسەلەکەی باسکرد کە هەر کۆمپیوتەرێکی تری کۆمپانیا پەیوەست بێت بە وێستگەوە مافی ئەوەی هەیە بە یەك کلیك بێتە ناو ئەم کۆمپیوتەرە، منیش پرسیارم کرد ئایا نەتوانێت گەشتی کاتژمێر شەشی دوای نیوەڕۆم بۆ دابین بکات کە بەرەو جوهانسبۆرگ دەچوو، ئەگەر تەنها یەك کورسی مابێتو وێستگەی تر هەوڵ بدات ئەو کورسیە بگرێت؟ ئەوکات چی ڕوودەدات؟ ئەویش وتی یەکەم کەس ئەو کورسیە بگرێت ئیتر کەسی تر ناتوانێت بیگرێت، منیش بە گەرمی سوپاسم کرد و لە بینای هێڵە فڕۆکەوانیەکە چوومە دەرەوە، کە گەڕامەوە بۆ نووسینگەکەم، عەقڵم چەند بیرو بیرۆکەی دەخستەڕوو، ئەمە چۆن ڕوویداوە، دەموت کەواتە سرووشی موحەممەد (ﷺ) لە کۆمپیوتەرەکەی سەرۆکەوە (لەوحولمەحفووز) هاتووە:

﴿ بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ ﴿٢١﴾ فِي لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ ﴿٢٢﴾ ﴾ البروج: ٢١ - ٢٢

ئەو لەوحە وەك ئەوە نیە كە مووسا بەكاری هێناوە بۆ مشتومڕی دە ئامۆژگاریەكە، بەڵكو لەوحێكی بەردین نەبوو، وەك ئەوەی مامۆستاكانیش نیە كە لە خوێندنگەكاندا بەكاری دێنن و بە تەختەڕەش ناودەبرێ، لەوحەیەك نیە وەك شاشەی كۆمپیوتەر یان پەردەی سلیكۆنی، بەڵكو لەوحێكی پارێزەری خواییە كە بە هیچ ماددەیەكی هەستپێكراو ناتوانیت لێی تێبگەیت، چونكە لە بەرد یان كانزا دروست نەكراوە، بەڵكو رۆحیە، ئەی چۆن كار دەكات؟ تەنها دەتوانین مەزندە بكەین.

## مەسیحیەكانی نەجران:

لەكاتێكدا ئیسلام لە مەدینە هەنگاوی چەسپاوی دەنا و ناوبانگی پێغەمبەر(ﷺ) لە نیمچە دوورگەی عەرەبیدا بلاو دەبوویەوەو گەیشتە ئەو كۆمەڵە مەسیحیە عەرەبانەی كە لە نەجران لە نزیك یەمەن دەژیان، بیستیان عەرەبێك لە نیمچە دوورگەی عەرەبی بانگەشەی ئەوە دەكات سروشی خوایی بۆ هاتووەو بەناوی خواوە قسە دەكات، ئەوەبوو وەفدێك هاتن بەرەو مەدینە تا پێغەمبەر(ﷺ) تاقی بكەنەوەو زانستی ئەو سەبارەت بە خواو دینەكەی وەرگبگرن، كە هاتنە مەدینە لە مزگەوتی پیچغەمبەر (ﷺ) مانەوە كە

بینایەکی ساکار بوو لە دیواری قوڕ و سەقفێ لە گەڵای دارخورما دروست کرابوو، مەسیحیەکان نانیان خوارد و لە مزگەوت خەوتن، ئینجا ماوەی سێ ڕۆژ یان سێ شەو لە مزگەوت لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) مشتومڕیان کرد، دەکرێت لە کتێبەکانی فەرموودەدا وردەکاری ئەو بەسەرهات و گفتگۆیە وەربگرن.

لەکاتی گفتگۆکەدا یەکێك لە مەسیحیەکان پرسیارێکی خستەڕوو: ئەی موحەممەد پەیامت چیە سەبارەت بە خوا؟ پێغەمبەریش(ﷺ) روون وەڵامی دایەوەو نەکەوتە ئەملاولاکردن و هەوڵدان بۆ قسە هەڵچنین، بەڵکو موحەممەد(ﷺ) کە قسە دەکات یەك کلیکی ڕۆحانی دەکات(کلیك نەبووە تا دەستی پێدا بنێ بەڵام بە نموونە دەڵێین)، نموونەی خاتوونەکەی ناو نووسینگەی هێڵە فڕۆکەوانیەکە کە چووبووە ناو کۆمپیوتەرەکەی سەرۆکەوە وەڵامی لەوحولمەحفووز دەداتەوە، ئەوە هەمان کۆمپیوتەری سەرۆکەیە بەڵام بۆ هەموو زانستی سرووش، جارێکی تر وەك وتم دەپرسێت: پەروەردگارا دەبێت چی بڵێم؟ خێرا وەڵامەکە وەردەگرێت:

﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴿٤﴾﴾ الإخلاص: ١ - ٤

(بلّێ: ئەوە خوای تاك و تەنیا، ئەو خوایەی بێ نیاز و جێ ی نیاز و ئومێدە، کەسی لێ نەبووەو لەکەس نەبووە، وە هەرگیز هیچ کەس هاوشێوە و هاوتای نی یە)

دوای خوێندنەوەی دەقەکەی سەرەوەو گەیاندنی بە ئەمانەتەوە، ئیتر دەگەڕێتەوە سەر سروشتە ئاساییەکەی، عەرەبیەکی شیاو بەو ناوە نیە نەتوانێت دەنگ و گەرمی نێوان ئەو دوو گفتگۆیە جیابکاتەوە، وشەکانی سەرەوە هیچ وتەی موحەممەد پێغەمبەر نین، بەڵکو فەرمایشتی خوایە، بەلاّم لە زاری پێغەمبەرەوە وتراونەتەوەو پێغەمبەر(ﷺ) لەو کاتەدا تەنها وەك خوێنەرەوەی فەرمایشتی خوا بجوێ وەك چۆن کەسێك لە رادیۆ دەقێك دەخوێنێتەوە، ماددەی زانیاریەکان لە ناوەوە بەرنامەڕێژ کراوە، ئەو کۆمپیوتەرە لەناو دڵ و عەقڵیدایە، پێش دەیەیەك لە مەککە و لە بارێکی هەمان چەشندا پێی بەخشرابوو، لەو کاتەدا جوولەکە کە هەوڵیاندەدا بیخەنە تەنگاوێکەوە سەبارەت بە مەسەلەی (پێناس و وەچەی خوا) پرسیاریان لێکرد، ئەوان جیاواز نەبوو لەو جوولەکە فریسیانەی کە چاولەسەری عیسا بوون و چاوەڕێی هاتنی مەسیح بوون، ئەوەی پێشووش نموونەی چوارەم بوو سەبارەت بەوەی چۆن خوای گەورە سروشی بە زارەکی نارد بۆ سەر پێغەمبەرەکە، چۆن پێغەمبەر (ﷺ) ئەو سروشەی پاراست، چۆن زمانی مرۆیی لە پەیامدا بەکارهاتووەو بەکاردێت، چۆن ئێمەی شوێنکەوتوانی

پێغەمبەر موحەممەد(ﷺ) بتوانین لەوە تێبگەین تا لە هەر دەرفەتێکی گونجاودا بەکاری بهێنین.

لە ئەدەبی ئایینی جیهانیدا شتێ نیە تەنانەت بەراورد بکرێ بە سوورەتێکی کورتی وەك سوورەتی ئیخلاص کە پێشتر هێنامان، ئەگەر سورەتی ژمارە 112 تاقیکردنەوە بێت بۆ بیروباوەڕی یەکخواپەرستی، ئەوکات هەموو دەقەکانی تری قورئان شەرحی ئەوە دەکەن، چونکە لەوێوە سیفەتەکانی خوا دەردەکەون و بەوە پارێزراو دەبین لە کەوتنە ناو ئەو شیرکەی کە خەڵکێکی زۆر تێیکەوتون.

سیفەتەکانی خوا تایبەتین:

خوای گەورە لە زات و سیفاتەکانیدا تاك و تەنهایە، هیچ رێیەك نیە بەراوردی خوا و سیفەتەکانی بکات لەگەڵ کەسێ یان شتێکی تردا کە ئێمە دەیزانین یان دەکرێت بیهێنینە پێش چاو، لە کۆتایی سوورەتی ئیخلاصدا هاتووە ( وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ) ئەی چۆن دەتوانین بیناسین؟ دەتوانین لە رێی سیفەتەکانیەوە بیناسین.

کۆتا سروشی خوایی کە قورئانی پیرۆزە نەوەد و نۆ ناومان پێ دەبەخشێ سەبارەت بە ناوی خوا، ئەو نەوەدو نۆ سیفەتە یان ناوە بە

ناوەکانی خوا ناسراون و لە دەقی قورئانیدا وەك دەنکە مرواری بڵاوبوونەتەوە:

ئەمە نموونەیەك لەو دەنکانە:

﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ
ٱلْمُهَيْمِنُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ
﴿٢٣﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُ ۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٤﴾ ﴾ الحشر: ٢٣ - ٢٤

(ئەوە ئەو خوایە کە بێجگە لەو پەرستراوی تر نی یە پاشا و پاك و بێگەرد و ئاشتی دەر و دڵنیاکەرە و چاودێر و پارێزگار و زاڵ و خاوەن شکۆ و شایستەی هەموو گەورەیی یەکە پاکی و بێگەردی بۆ خوایە لەو هاوبەشانەی کە بۆی دائەنرێ، هەر ئەوە خوا و بەدیهێنەر و داهێنەر و وێنەکێشە هەر بۆ ئەوە هەموو ناوێکی هەرە جوان و پاك هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە ستایشی ئەو دەکەن وە هەر ئەوە باڵا دەستی کار بەجێ)

جوانترین ناوه‌كان:

له‌و دوو ئایه‌ته‌ی پێشووه‌وه كه هێنامان، سیانزه سیفه‌تی خوای گه‌وره هاتون، ته‌نانه‌ت دوژمنه سه‌رسه‌خته‌كانی ئیسلام ناچار ده‌بن كاریگه‌ر بن به واتای سیفه‌ته‌كان چ له ده‌قه عه‌ره‌بیه ره‌سه‌نه‌كه و چ له وه‌رگێران و راڤه‌یان به شێوازێكی بالآ و جوان.

چۆن كه‌سێك نه‌خوێنده‌واری ناو گه‌لێكی نه‌خوێ،ده‌وار توانی ئه‌و نموونه جوانه بهێنێت كه وا ماوه‌ی چوارده سه‌ده‌یه رێ ده‌كات؟ هیچ سه‌رچاوه‌و ئینسكلۆپیدیایه‌كیش نه‌بوو تا موحه‌ممه‌د(ﷺ) پشتیان پێ ببه‌ستێت با ته‌نانه‌ت له ده‌وروبه‌ری بیابانی نیمچه‌دورگه‌ی عه‌ره‌بیشدا بوایه، جا چۆن موحه‌ممه‌د(ﷺ) ئه‌و كانه‌ی زانستی یه‌كخواپه‌رستی دۆزیه‌وه؟ ئه‌و ده‌یفه‌رموو(هه‌رچیه‌كم له خواوه بۆ هاتووه له رێی سروشه‌وه بووه) جا چۆن ده‌توانین ئه‌مه شه‌رح بكه‌ین؟

باشترین ئه‌زموون ده‌بێت كه پرسیار له هاوڕێ شاره‌زاكانمان بكه‌ین تا هه‌ندێ سیفه‌تی خوامان پێ بلێن، دڵنیاشتان ده‌كه‌مه‌وه زانستی ده‌ستكه‌وتووی پرۆفیسۆره‌كانی زانستی لاهووت و مامۆستایانی ئه‌و بواره ناتوانێت نموونه‌یه‌كی ئه‌و بواره‌مان پێ ببه‌خشێت، جا كه‌سی ژی ده‌پرسێت تۆ ده‌زانیت موحه‌ممه‌د (ﷺ) هه‌ڵكه‌وته بووه‌و كه‌سی هه‌ڵكه‌وته ده‌توانێت ده‌یان جار به‌سه‌ر ئێمه‌دا زیاتری هه‌بێت، له وه‌ڵامدا ده‌ڵێین كه‌سی هه‌ڵكه‌وته

دەتوانێت دە هێندە لەپێش ئێمەوە بێت و موحەممەد (ﷺ) کە پێغەمبەری خوایە نەوەدو نۆ سیفەتی بۆ باسکردوین، بەڵام ئەوەی وایکردووە ئەو لیستەی موعجیزە بێت ئەوەیە ناوی (ئەب) باوکی تێدا نیە، ئەمەش موعجیزەیە.

باوك لە ئاسمان:

موعجیزەی لیستە نەوەدونۆ ناویەکەی موحەممەد (ﷺ)کە ناوەکانی خوای هێناوە، لەوەدایە کە ئەو ناوە تایبەتەی تێدا نیە کە بریتیە لە وشەی (ئەب) باوك کە ماوەی بیست و سێ ساڵی تەمەنی پێغەمبەرایەتی ئەو ناوەی لەبەردەستدا بوو، کەچی بەکاری نەهێنا و ماوەی دوو دەیە دووری گرت لە وشەکانی، ئێستا ئەو وشەیە لە دەرەوەی زانستی یەکخواپەرستیدایە.

ماف خۆتانە بپرسن ئەی سەبارەت بە ناوی خوای نوێژکەرە مەسیحیەکان چی؟ بەڕێز دیدات بخوێنەرەوە (ئەی باوکمان لە ئاسمانەکاندا، ناوت پیرۆزەو و مەملەکەتیشت بەم زوانە دێت و لەسەر زەویشدا دەبیت وەك لە ئاسمانەکان هەیت).[1]

---

[1] - ئەمە لیستی موحەممەد (ﷺ) نیە، قورئان دەستکردی مرۆیی نیە، بەڵام من کاتێ ناموسڵمانان دەوێنم ئەو چەمك و ناوانە بەکاردێنم.

ئەمە چ هەڵەیەکی تێدایە؟ دەڵێن هیچ؟ ئەی ئیتر بۆچی موسڵمانان پێی هەستیارن؟ من وەك نەیارەکانمانزۆر دوژمنایەتی نانوێنم، نوێژی مەسیحیەکان نوێژێکی جوانە، بەلاّم کەموکورتیەکی دیاریکراوی تێدایە، ئێوە پێتان وایە منداڵەکەم لەو نوێژەدا تەنانەت ناوی خواش فێر نابێت، ناوی خوا چیە؟ لە هەموو بیست و دوو کتێبی عەهدی جەدیددا ناوی خوا یەکجاریش نەهاتووە، وشەی ئەب (باوك) وەك بەدیلێك هاتووە، ئەگەرنا ئەوە ناوی خوا نیە، وەك سیفەتێ واتە گەورەو خوا و بەدیهێنەر، ئێمەی موسڵمان لەگەڵ ئەو واتا نوێیە نین کە لە وشەی ئەبەوە وەرگیراوە.

لە زانستی لاهوتی مەسیحیدا ئەم وشە ساکارە خاوێنەمم دەستکەوت(ئەب) بەپێی مەسیحیەت ئەوە باوکی عیسایە، ئەوان لە کتێبی کاتشیزمدا دەڵێن عیسا خوایەکی کردارییە لە خوایەکی کرداری، لە باوك لەدایك بووە، لەدایکبووە کەچی مەخلووق نیە، ئەگەر ئەم وشانە واتایەکیان هەیە، چی دەگەیەنن؟ بەدڵنیاییەوە واتاکەیان ئەوەیە کە بەپێی کتێبی پیرۆز خوا چەندین منداڵی هەیە، ئادەم و ئیسرائیل و ئیبراهیم و یووسف و سولەیمان و ..هتد، بەلاّم هەموو ئەمانە منداڵی مەجازین، خوای گەورە وەك بەدیهێنەر و سەربڵندێ باوکی مەجازی هەریەك لە دروستکراوەکانیەتی، ئیتر مرۆڤ بن یان ئاژەڵ، بەلاّم مەسیحیەکان دەڵێن عیسا وەك ئەوان نیە و لەدایکبووە بەلاّم مەخلووق نیە، بەپێی ئیسلام ئەم قسە زۆر بێزراوترە،

چونکە وەسفی خوا بە سروشتێکی مرۆیی دەکات کە ئەویش بریتیە لە ئەرکی وەزعی مرۆیی و ئەویش جووتبوون دەگرێتەوە.

گۆڕینی واتاکان:

لە سەرەتادا وشەی ئەب(باوك) بۆ خوا هیچ پێوەستیەکی کوفری نەدەگەیاند، بەڵام دواتر واتای وشەکان گۆڕان، (جا نموونەی زۆر هەیە کە وشەیەك لە بنەڕەتدا واتایەکی ئاسایی هەیە، بەڵام دواتر بە تێپەڕبوونی کات واتایەکی ناشیرین دبەخشرێت بەو وشەیەو ئیدی بەکارهێنانی نارەوایە، نووسەر لێرەدا چەند نموونەیەکی بۆ وشەی زمانە بیانیەکان بەکارهێناوە کە بە پێویستمان نەزانی دایبنێینەوە چونکە بۆ وەرگێڕانە کوردیەکە پێویست نین و تەنها مەبەستیەتی ئەم پەیامە بگەیەنێت کە خستمانەڕوو) (وەرگێڕ).

پەروەردگار یان باوك:

خوای گەورە لە ڕێی موحەممەدەوە ئیسلام و موسڵمانانی پاراست، ئەویش بە دوورگرتنی ئەو وشەی ئەبە کە مەبەست پێی خوایە لە فەرهەنگی وشە ئایینیەکاندا، ئەمەش حەقیقەتی موعجیزەی قورئانی پرۆزە کە نەوەدو نۆ ناوی خوای هێناوە وێڕای وشەی (ڕەب) یش کە واتای گەورەو پشتیوان و

پەروەرشیار دەگەیەنێت، ئەم دەستەواژەیە لە قورئاندا چەندین جار هاتووە، بەڵام وشەی ئاسانتر وشەی ئەبە کە لە زمانی عەرەبیدا واتای باوك دەگەیەنێت و لە عیبریشدا بۆ یەك جاریش بەکارنەهاتووە، موسڵمانان بەوجۆرە پارێزراو دەبن لەو کوفرەی منداڵ بۆ خوا دادەنێت، جا لەم کارەدا قەرزاری کێین؟ قەرزاری خوا یان موحەممەد؟ موحەممەدی پێغەمبەر(ﷺ) نکوولی هەر بەرپرسیارێتیەك دەکات و هەمیشە دەڵێت هەموو ئەوەی هێناومە لە ڕێی سروشەوە بۆم هاتووە، ئەو وشانەی دەیانبیستن هی موحەممەد نین، بەڵکو فەرمایشتی خوان و وەك خۆیان نووسراونەتەوە.

## باسی چوارەم: چارەسەری ناکۆکیەکە:

قورئانی پیرۆز موعجیزەیەکی گەورەیە و پڕەو لەو موعجیزانەی کە دەکرێت لە هەزاران لاوە شەرحیان بکەیت، من لە چەند لایەکی ئادەوە هەوڵمداوە باسی ئەو موعجیزانە بکەم و ئێوەشی تێدا بەشدار دەکەم، وەك هەر کەسێکی تری ناو ئەو جەماوەرە پێی سەرسامم، سنوورێك نیە بۆ کۆتایی توێژینەوەکە، ئەو ئەرکە جێدێڵم بۆ ئەو برایانەم کە زانستیان زۆرە، بۆ زانایانی عارفی ئیسلام، لەوانەشە تا لە ژیاندا ماوم ئەو هەوڵانە ببینم، ڕێ بدەن بە نموونەیەکی کورت کۆتایی بەم باسە بهێنم.

پێش چەند ساڵێك لەمەوبەر، لە سوازیلاند ناکۆکیەك دروست بوو، پاشا سوبیوزا دەسەڵاتی هەڵبژێردراوی خۆی لەدەست دا و کڵێسا مەسیحیەکانی ناو دەوڵەت ماوەیەکی زۆر پێش هاوسەرگیری ئەو پیاوە لەو مەسەلەدا دەهاتن و دەچوون و خۆیان یەکلا نەدەکردەوە، مەسەلەکە لە مشتومڕدا زۆر سەخت نەبوو، چونکە هێشتا پاشا هەشت ژنی هەبوو، بۆیە مەسەلەکە گۆڕا بەوەی ئافرەت ئەگەر مێردەکەی مرد پێویستە چەندە چاوەڕێ بکات؟

لە گەرمەی ئەم مشتومڕەی ناو شانشینە بچووکەکەدا، پاشای بەڕێز فەرمانی کرد بە کۆڕبەندی کڵێساکانی ناو هەموو کڵێساکانی دەولچەت تا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن.

بەڕێز مووس برومان کە برای سوازی بوو و موسڵمان بووبوو، داوای لە پاشا کرد با موسڵمانانیش بەشداری مشتومڕەکە بن، پاشا گەورەیی نواند و منیش توانیم بەشداری مشتومڕەکە بم.

لە رۆژی یەکشەممە و لە بەرەبەیاندا پاشا و نوێنەرانی دەستە مەسیحیەکان کۆبوونەوە تا بگەنە کۆدەنگیەك لەسەر ماوەی چاوەڕوانی ژن دوای مەرگی پیاوەکەی.

یەك دوای یەك هەموان قسەی خۆیان کرد، خوای گەورە وزەی بلی گراهام یان جیمی سواگارتتی داوە بە یەکە یەکەی ئەفریقیەکان، لە کۆتایی

هەر وتارێکدا جەماوەر بە توندی چەپڵەیان لێدەدا. ئینجا کەسی دواتر دەهات و قسەی کەسی پێش خۆی سووك و بێبایەخ دەکرد و چەپڵەیەکی باش بۆ ئەویش لێدەدرا، لە بەیانیەوە تا ئێوارە بارەکە ئاوا بەردەوام بوو، لە نزیکەی کاتژمێر پێنجی ئێوارە بوو کە سەرەی من هت، منیش وا دەستم پێکرد(لە بەیانیەوە تا ئێوارە بەدوای وەڵامێك دەگەڕێین بۆ ماوەی چاوەڕوانی ئافرەت دوای مەرگی پیاوەکەی ئینجا کەی بتوانێت هاوسەرگیری دووەم بکاتەوە، بیستمان عەهدی قەدیم و عەهدی جەدید چی دەڵێن، بەلام وەڵامێکمان دەست نەکەوت، جا بۆ چارەسەری کێشەکەمان لە عەهدی کۆتاییدا (قورئانی پیرۆز) ئەنجامێك هەیە.

کە وتم عەهدی ئەخیر وەك تەقینەوەیەك وابوو بۆ قەشەو موژدەدەبەرە مەسیحیەکان، چونکە ئەوان هەرگیز ئەو دەستەواژەیان نەبیستبوو، بەڵگەی عەهدی قەدیم و جەدید هاوکار نین، چونکە **وەلامەکەی عەهدی ئەخیر** لە خواوەیە بۆ مرۆڤایەتی.

قورئانەکەم خستە سەر سەرم و تەنها دەقە ئینگلیزیەکەی وەرگێڕانی واتاکانی قورئانم خوێندەوە تایبەت بەم ئایەتە:

﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ۖ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِىٓ أَنفُسِهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٣٤﴾ ﴾ البقرة: ٢٣٤

(ئەو پیاوانەی دەمرن لەئێوەو هاوسەران جێ دەهێڵن هاوسەرەکانیان چاوەروانی دەکەن چوار مانگ و دە شەو ئینجا کە عیددەیان تەواو بوو ئیتر گوناهتان لەسەر نی یە (ئەی کەسوکاری ژن) لەوەی کە (ئەو ژنانە ) دەیکەن لەخۆیاندا بەپێ ی باوی ناو کۆمەڵ وە خوا ئاگادارە بەوەی کە دەیکەن.)

لە جەماوەرم پرسی ماوەی چوار مانگ و دە رۆژ، ئایا پێویستتان بە هیچ راڤەو شیکردنەوەیەك هەیە؟ هەموان بە یەك دەنگ وتیا نا، ئینجا حیکمەتی ماوەی چوار مانگ و دە رۆژم بۆ کابرایەکی زانای مەسیحی باسکرد، ئایەتەکانی تریشم لەو بارەوە بۆ باسکرد، ماوەی چاوەڕوانی دوای تەلاق ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ۚ ﴾ البقرة: ٢٢٨

ئەمە کاتێك وشەی تەلاق چاکترین چارەسەر بیت بۆ کێشەکە، بەلاّم کە بوو بە بێوەژنی ئەوە مانگێك و دە رۆژی بۆ زیاد دەکرێت وەك چارەسەرێ، شتێکی مەنتیقی بوو هەموان بەوە رازی بوونایە، بەلاّم بۆچی نا؟

چ پیاوێکی ژیر دەتوانێت مەزندەی ئەوە بکات سێ مانگی دوای تەڵاق و چوار مانگ و دە ڕۆژی دوای مردنی مێرد، خۆ موحەممەدیش (ﷺ) وەک هەر کەسێکی تر بە وردی ئەو مەزندەیە دەکات! ئەمە ڕاستە، بەڵام بەڵگەکە ئەوەیە کە ئەم ڕێنماییە دروست و بەسوودانە دەستکردی موحەممەد نین، بەڵکو خوای گەورە بڕیاری لەسەرداوە، بڕوانە ئایەتی دواتر:

﴿ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُوا۟ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ۚ وَلَا تَعْزِمُوا۟ عُقْدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْكِتَٰبُ أَجَلَهُۥ ﴾ البقرة: ٢٣٥

(وە گوناهتان ناگات لە خوازبێنی ژنانی(مێرد مردوو) بە ناڕاستەوخۆ پێیان بڵێن یا لەدڵی خۆتاندا(بڕیار بدەن) دەیان خوازن خوای گەورە زانیویەتی کە بێگومان ئێوە لەمەو دوا ناویان دەبەن بەڵام بەنهێنی بەڵێنیان پێ مەدەن مەگەر قسەیەک کە باش بێت وە بڕیاری مارەکردنیان مەدەن تا عیددەکەیان تەواو دەبێت وە بزانن بێگومان خوا دەزانێت بەوەی کە لە دڵتاندایە کەواتە خۆتان بپارێزن وە بزانن دڵنیابن کە خوا لێخۆشبووی لەسەر خۆیە.)

حیکمه‌تی خوا:

خوا ده‌فه‌رموێت:

﴿ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُوا۟ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ۚ وَلَا تَعْزِمُوا۟ عُقْدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْكِتَٰبُ أَجَلَهُۥ ﴾ البقرة: ٢٣٥

ئه‌مه له زیره‌کی موحه‌ممه‌ده‌وه نیه، به‌ڵکو حیکمه‌تی ئه‌و خوایه که داناو زانایه به هه‌موو شتێك، خوای به‌دیهێنه‌ر شاره‌زایه به هه‌موو شتێك و لاوازی به‌دیهێنراوه‌کانی ده‌زانێت، له‌وانه‌یه پیاو به چاوچنۆکی خۆی مافی بێوه‌ژن بفه‌وتێنێ و ده‌رفه‌ت بقۆزێته‌وه، ئافره‌ت پشتیوان و پاڵپشته‌که‌ی له‌ده‌ستداوه، بڕێ ده‌می بچووکی هه‌ن که ده‌یه‌وێت تێریان بکات، له‌وانه‌یه به‌ها و گرنگی خۆیشی له‌ده‌ست دابێت، بۆیه ئه‌وکات ئه‌و ژنه په‌یوه‌ستی عاتیفه‌و سۆزداری خۆی ده‌بێت و باری نائاسایی ده‌بێت، ئه‌وکات راوچیه‌که دێته پێشه‌وه، ئافره‌ته‌که‌ش له په‌له‌په‌ل و له‌به‌ر که‌می ئارامی ده‌روونی له‌وانه‌یه رازی بێت، خوای گه‌وره ئاگاداره به بارو به‌زمی پیاوان و لێره‌وه هۆشیاری ده‌دات:

﴿ وَلَا تَعْزِمُوا۟ عُقْدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْكِتَٰبُ أَجَلَهُۥ ﴾ البقرة: ٢٣٥

عیددەی دوای تەڵاق سێ مانگە، چل ڕۆژ زیادە دەڕێت بەو ئافرەتە تا هاوسەنگی خۆی وەربگرێتەوە، ئەگەر لەو ماوەدا پێشنیازی هاوسەرگیری بۆ بکرێت، ئەوە دەرفەتی دەبێت تا دوور لە بڕیاری سۆزداری لەگەڵ هاورێ و خزمانیدا مشتومڕ لەسەر پێشنیازەکان بکات، دەتوانێت پەلە نەکات لە رازی بوون و لەسەرخۆ بڕیار بدات، ئایا موحەممەد (ﷺ) لەناو ئەو بیابانەدا چواردە سەدە لەمەوبەر بیری کردووەتەوەو ئەم هەموو شتانەی لێ دەرهێناوە؟ بەداخەوەم کە ئێوە دەیدەنەوە پاڵ موحەممەد و بە کردەی ئەوی دەزانن!

چەندین جار هەوڵ دراوە تا ئەوە دووبارە بکرێتەوە حیکمەتی قورئانی دەستکردی موحەممەد نیە، بەڵکو سروشێکە لە خوای گەورەوە بۆی دابەزیوە، ئەگەر هێشتا گومانت هەیە لەوە، دەی بڕۆ بەدەم تەحەددای قورئانەوە کە دەفەرموێت:

﴿ قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴿٨٨﴾ ﴾ الإسراء: ٨٨

(ئەی (موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) بڵێ سوێند بەخوا ئەگەر ئادەمی و پەری هەموو کۆببنەوە بۆ ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بێنن ناتوانن وێنەی ئەو بێنن هەرچەندە پشتیوانی یەکتریش بن.)

تەحەددای هەموو جیهان دەکرێت تا نموونەیەکی قورئان بهێنن، بەلام ماوەی چواردە سەدەیە کەس نەیتوانیوە، مەسیحیە عەرەبەکانیش ئەو تەحەددا دەیگرتنەوە، بەلاّم برێ ئینجیلی مەسیحییان لەسەر شێوازی قورئان بەرهەم هێنا، کەوتنە دزی کردن لە قورئانی پیرۆز بە دزینی وشەکان و لەوەشدا (بسم الله الرحمن الرحیم) یان لەبیر نەکرد.

لە هەموو ئیصحاحێکی ئەو بەرهەمە نوێینەا بە یەکەم ئایەتی سروشی قورئانی دەست پێ دەکات بسم الله الرحمن الرحیم).

ئەمەش بەڵگەیەکی ترە، ئەگەریش بەڵگەی زیاترت دەوێت کە قورئان نموونەی نیە، تۆ تاقی بکەرەوە بزانە دەتوانیت نموونەیەکی وەك قورئان بهێنیت، خۆ هێشتا تەحەدداکە ماوە، بۆیە بزانە قورئانی پیرۆز فەرمایشتی خوایەو دابەزێنراوە بۆ سەر موحەممەد(ﷺ)، قورئان موعجیزەی موعجیزەکانە، (بەراستی قورئان موعجیزەیە)[1].

سوپاس بۆ خوا تەواو

# پێرست

**بابەت ............................................ لاپەڕە**


| | |
|---|---|
| پێشەکی وەرگێڕ | 3 |
| بەشی یەکەم: وتەی کتێبی پیرۆز سەبارەت بە موحەممەد (ﷺ) | 9 |
| باسی یەکەم: یەکەم دیمانەم | 11 |
| باسی دووەم: هەشت بەڵگەی بێ چەنوچوون | 21 |
| باسی سێەم: بەڵگەی زیاتر | 29 |
| باسی چوارەم: یووحەننا دژی مەسیح دەوەستێتەوە | 33 |
| بەشی دووەم: موحەممەد(ﷺ) جێگرەوەی حەقی پێغەمبەر عیسایە | 51 |
| باسی یەکەم | 53 |
| باسی دووەم: لە وتەکانی مامۆستا | 65 |
| باسی سێیەم: موحەممەد هەمان براکلیتە | 79 |
| باسی چوارەم: سەرکردایەتی گشتگیر | 101 |

| | |
|---|---|
| باسی پێنجەم: پێشبینیە بەدیهاتووەکان | 123 |
| بەشی سێیەم: موحەممەد پێغەمبەر(ﷺ) | 147 |
| باسی یەکەم: هەڵبژاردنی هەموو | 149 |
| باسی دووەم: لە مێژووی رابردووەوە | 173 |
| بەشی چوارەم: قورئان موعجیزەی موعجیزەکان | 229 |
| باسی یەکەم: تەحەددای هەمیشەیی | 231 |
| باسی دووەم: سروشی قورئانی و زانستەکان | 245 |
| باسی سێیەم: قورئان زۆر ناوازە نووسراوەتەوە | 263 |
| پێڕست | 313 |